سالار مەحمود

# ئەنفال و دادگا

بەهاری ٢٠٠٧

مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ك)
سلێمانی ـ گەڕەکی ئاشتی ـ ١٠٤
شەقامی ئاشتی ـ٢٢ ـ ١٠٣٢
ژ خانوو ـ ٦٢

www.hoshyari.org
govarynovin@yahoo.com

ناوی کتێب: ئەنفال و دادگا
ناوی نووسەر: سالار مەحمود
دیزاینی ناوەوە: فەهمی جلال
پیتچنین: دەریا عادل، عەباس مەحمود
هەڵەچن: حەسەن عەباس
بەرگ: ئەحمەدی خۆشنووس
ژمارەی سپاردن: (٣٠٧)ی ساڵی ٢٠٠٧
تیراژ: (١٠٠٠)
ژمارەی زنجیرە: (٢٢٠)
(٢٥٤) لاپەڕەیە
چاپ: دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی
لەبڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاری (ی. ن. ک)

## پێڕست

## پێشەکی:

مامۆستا جەعفەر

گەلی کوردستان، بەدرێژایی مێژوو، لەڕۆژهەلاتو لەڕۆژئاواوە، لەشکری داگیرکەران، بەلێشاو رژاوەتە پێدەشتو بناری شاخەکانیەوە. ئەم ولاتە لەزوڵمو زۆرو کوشتنو بڕینو کاولکردن، پشکی شێری بەرکەوتووە. هەموو جارێك تاوانباران وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەرچوون، خەڵکی ئێمەش، سەریان بەبن لەشیانەوە کردووەو برینەکانیان لەستۆتەوەو سەرلەنوێ لەخاڵی سفرەوە (٠) دەستیان پێکردۆتەوە.

ئەمجارەیان رژێمی پێشوو، هەموو سنووری مرۆڤایەتی تێپەڕاندو هەر چەکێکی کۆکوژو ترسناکی دەست کەوتبێت، بەبێ پرینگانەوەو سڵکردنەوە، بەکاریهێناوە. ئەمجارەیان خەونی کانیو دارگوێزو کەویش هاتەدی: سەدامو بەشێك لەسەرانی رژێمی پێشوو، سەبارەت بەتاوانی دژی مرۆڤایەتیو پاکتاوی نەژادیو کۆکوژی، بۆ بەردەم دادگا راپێچ کران.

دادگایکردنەکە، ئەگەر کاردانەوەیەکی سیاسی رووداوو مانۆڤەرێکی کاتیو شانۆگەرییەکی درامی زیندوو بێتو تەنیا بۆ ئیدانەکردنی رژێمی پێشوو بێتو بۆ تۆڵەکردنەوەی شەخسی بێت، ئەوە دڵی خەڵکی کوردستان ناو ناخواتەوە. ئێمە دەمانەوێت: جارێکی تر ئەنفالو کیمیابارانو راگواستنو پاکتاوی نەتەوەیی دووبارە نەبێتەوە. ئێمە دەمانەوێت: لەعیراقی ئێستاو داهاتوودا، جارێکی تر دەسەڵاتی ناوەندی، یان هەر دەسەڵاتێکی هاوشێوە، نەتوانێ شاڵاوی ئەنفالو کیمیابارانو دێهات راگواستن، نەکات.

ئێمە پێمانباشە: عیراق، دەوڵەتی قانوون بێتو سیستمی ناوەندی هەڵوەشێتەوەو فیدراڵی شێوەی دەوڵەتو سیستمی سیاسی بێتو دامەزراوەی دیموکراسیو کۆمەڵی مەدەنی چالاك بێت. لەههەلومەرجی ئەوتۆدا، دەزگای تەنفیزی، کاری رۆتینی خۆی دەکاتو دامودەزگای نهێنیو جاسوسیو سوپایی، رێگەی دروستبوونیان نادرێت، تەنیا لەچوارچێوەی دەستوورو قانووندا نەبێت.

بەباڵادەستبوونی دەوڵەتی قانوونو سەقامگیربوونی سیستمی دیموکراسیو فیدراڵی، رێگەی پێشێلکردنی مافی مرۆڤ دادەخرێت. کەواتە: هەرچی زیدەرۆییو دەستدرێژیو قانوونشکێنی هەیە، مەترسی سەرهەڵدانی نامێنێت.

ئێمە تۆڵەی ئەنفالو کیمیابارانو راگواستنو ئەو هەموو زوڵمو زۆرەی بەدرێژایی مێژوو لێمان کراوە، بەدادگایکردنو حوکمدانی

تاوانباران، ناکەینەوە. دەبێ سیستمێکی دیموکراسی و مۆدێرن جێگەی سیستمی ناوەندی دواکەوتوو بگرێتەوەو لەدەست دێوەزمەی تیرۆرو نەبوونی ئارامی و ئاسایش، دەربازمان بکات.

پرۆسەی دادگاییکردنەکە، خۆی لەخۆیدا، وانەیەکی باش و بەسوودە بۆ دەوڵەمەندکردنی پرۆسەی دیموکراتی و راستی خستنەڕوو، لەڕێگای میدیای سەربەخۆو ناسەربەخۆوە، لەسێبەری دادوەری و قەزای سەربەخۆدا.

دیارە ئەمە جاری یەکەمە لەمێژووی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، نوێنەری دەسەڵاتی لەسەرکار لابراو، بەکۆمەڵ دادگایی بکرێن، قوربانیەکان وەکو شایەت، لەڕێگای قانوون و دادگاوە، شایەتی خۆیان پێشکەش بکەن و داوای مافی خۆیان «قەرەبوو»ی رۆحی و مادی و مەعنەوی لەجەلادەکان بکەن.

ئەم بەرهەمەی کاک سالار مەحموود لەسەر ئەنفال، یەکێکە لەهەوڵەکان بۆ تێگەیشتن و لێکدانەوەی «ئەنفال و دادگا» و من خۆم ئەم هەوڵە، بەکارێکی رەواو پێویست دادەنێم. مێژوونووسە ئەمریکیەکان پاش نزیکەی پەنجا ساڵ بەسەر (دادگاییکردنی نویرنبیرگ)بەناوبانگدا، هێشتا هەر هەوڵ دەدەن، لەڕێگەی ئیفادەی تاوانبارانەوە، کە لەکاتی لێپێچانەوەو لەکاتی پرۆسەی دادگاییکردندا، وەریان گرتبوو، لەو پەنجەرەیەوە مێژووی سەردەمی نازیەکان بەباشی تێبگەن و دەوری هەر کەسێك لەو مەکینە گەورەیەی شەڕی دووەمی

جیهانی هەڵگیرساند. پەنجەرەیەك بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەكانی دامەزراندن و بەردەوامبوونی كاریگەریتی و هەڵسوڕاندنی دەزگاكانی دەسەڵاتی نازی (١٩٣٣ ـ ١٩٤٥) دروست بكەن.

مەلەفەكانی دادگایی ئەنفال، ئەوە مێژووی نەنووسراوی ئێمەیە. ئاواتەخوازم، حكوومەتی فیدرالی عیراق، یان حكوومەتی هەرێم، بەرێكوپێكی وەكو خۆی، بەچاپی بگەیێنن. لەزانكۆ بەشی مێژوو، یان زانستی سیاسی ـ سۆسیۆلۆگی، كورسییەك بۆ ئەنفال دابنرێت. لەزانكۆی بەغداو مووسڵ و بەسرەش پێویستە لەو بەشانەی لەسەرەوە ئاماژەیان پێكرا، كورسی ئەنفال بكرێتەوە.

مێژووی ئەنفال و تاوانەكانی رژێمی پێشوو، بەشێكە لەمێژووی نوێی گەلی كوردستان و بەبێ كاركردن لەسەر مەلەفی ئەنفال، مێژووی نوێمان، كەلێنی تێدەكەوێت.

دوو خاڵی تریش هەیە، كە پێویستە مێژوونووس و پسپۆران بایەخی پێ بدەن:

یەكەم: تاوانی كۆكوژی، كە لەئەدەبیاتی سیاسی جیهانی بەهۆلۆكۆست ناوی رۆیشتووە، لەكاتی تەقینەوەی شەڕی گەورەتردا، روویان داوە. جەنگی جیهانی (١)و (٢). لەگەرمەی رووداوە خوێناویەكاندا، جەلادەكان (دوژمن)ی بێچەك و بێدیفاعیان بیرنەچۆتەوەو حەملەی سەربڕین و زیندە بەچاڵكردنیان رێكخستووەو تاوانی زۆر گەورەی دژ بە مرۆڤایەتی ئەنجامداوە.

دووەم: بـەکارهێنانی ((چـەمك))ی ((ئـەنفال)) لەسەر جیاوازی عەرەبیـە کۆنەکاندا، هەر زۆر لە ((چەمك))ی ((ئەنفالی سەدام)) یـەوە هاوشێوەو نزیکە.

من هەر وەکو نموونە بڕگەیـەکی کورت لـەکتێبی (تجارب الأمـم)ی (ابي علي أحمد مسكويه ـ المتوفي عام ٤٢١هـ) بنووسمەوە:

ـ (لما بلغت الهزيمـة يـزد جـرد، سار مـن حلوان نحـو الجبـل، وقـدم القعقـاع حلـوان. وكوتـب عمـر بفـتح جلـولاء و نـزول القعقـاع حلـوان، وإستأذنوه في اتباعهم، فقال:

ـ ((وددت أن بـين الـسواد وبـين الجبـل سـداً مـن نـار لايخلـصون الينـا ولانخلص إليهم. حسبنا من الريف السواد. إني قد آثرت سلامة المسلمين على الأنفال)) [*] )

مـن نـاڵێم: ((چـەمك))ی نـوێ و کـۆنی ((ئـەنفال)) یەکێکـەو هـیچ جیاوازییەکی نییە، بەڵام بەڕاشکاوی دەوێرم بنووسـم، چـەندین هێڵی هاوتـەریب، بـەدی دەکرێـت. سمبۆلـەکانی ڕژێمـی پێشوو، ویـستویانە هەسـت و سـۆزی ئـاینی لای خـەڵکی سـادەی عـەرەب بـوروژێنن و بـۆ ئامانجێکی شۆڤێنی و ڕەگەزپەرستانە بەکاریبهێنن.

---

[*]. مسكويه ؛ ابي علي احمد بن محمد بن يعقوب مسكويه: تجارب الأمم، تحقيق سيد كسروي حسن، المجلد الأول، ط٢، بيروت ٢٠٠٢، ص ٣٢٣.

بەشێوەیەکی گشتی، ڕێکخراوە سیاسیەکان، لەسەر مەسەلەی ئەنفال، کاری زۆریان کردووە، بەڵام ئەو کارکردنە، لەگۆشە نیگای زۆرپێن ساڕێژکردنو وێناکردنی تراجیدیاو کارەساتەکە بووە! هەوڵی تێگەیشتنی بابەتیو کاری زانستیو تیۆری.. هێشتا دەستی پێنەکردووە...



# سەرەتایەکی گەش

## لەیەکەم دانیشتنی دادگادا

دواجارو دوای چاوەڕوانییەکی زۆر، سەرەتای بەدادگایی دانی ئەنجامدەرانی تاوانەکانی دەرهەق بەخەڵك و خاکی کوردستان دەرکەوت. لەکاتژمێر دوانزەی نیوەڕۆی ٢٠٠٦/٨/٢١ دا، دادگای باڵای تاوانەکان لەعێراق بەتۆمەتی ئەنفال سەدام حسێن و عەلی حەسەن مەجیدو چەند تاوانبارێکی تری ئەنجامدەری شاڵاوەکانی ئەنفالی ساڵی هەشتاوهەشتی بانگهێشتی بەردەم دادگا کرد. بۆ لێپێچینەوە لەو دۆسیەیە. بۆ یەکەم جارە بەو شێوەیەی کەبینرا سەرانی رژێمی بەعس لەپای یەکێك لەو تاوانانەی لەمێژووی دەسەڵاتیاندا لەعێراق بەسەر گەلی کوردیاندا هێناوە، راستەوخۆو لەبەردەم رای گشتی جیهانی و ناوچەیی و ناوخۆییدا رووبەڕووی لێپرسینەوە دەبنەوە.

ئەمە جگەلەوەی سەرەتایەکی گرنگ و چارەنووسسازە لەهەمانکاتدا هەڵگری چەندین ئاماژەی دڵخۆشکەری پەیوەست بەئاییندەو چارەنووسی کوردەوە هەیە. چونکە چیدی لای هیچ دەسەڵات و رێکخراوێکی نێو دەوڵەتی و ناوەندێکی جیهانی کارەسات و کۆستی ئەنفال ناڕوون یان شاراوە نابێت. بەتایبەتی لەکاتێکدا بینیمان سەرۆکی داواکاریی گشتی و یاریدەرەکەی بەجۆرو شێوازێك باس و خوێندنەوەی لەسەر ئامادەکارییەکانی رژێمەکە بۆ شاڵاوەکەو

دەسپێکردنی و دواتر بەڕێوەچوونی قۆناغەکانی ئەنفال کرد و بەوڵێ ( ئێستا ئەو کاتەیە تێکڕای مرۆڤایەتی گەورەیی ئەو تاوانانە بناسێ کەدەرهەق بەکورد کراوە). ئەمە وتەی داواکاری گشتی بوو لەدادگادا. لەگەڵ چەندین دەستەواژەو بڕگەی گرنگ و دڵخۆشکەر. کەدەکرێ لەم سەرەتایەوە هێندەی تر بەشەوقەوە چاودێری بەڕێوەچونی ڕەوشی دادگاییەکە بکەین. لەراستیدا وەکو چۆن لەچەند جێگای ترو پێشتردا ئاماژەمان پێداوە ئەم دۆسیەیە؛ ئەشێ ببێتە ناسنامەیەکی بەنرخی ئەوتۆ بۆ کوردو چارەنوسی کوردستان؛ کەبەشێکی زۆری ئەو دەستکەوتانەی لەڕووی نیشتمانی و نەتەوەییەوە لێرە بەدواوە بەدەست دێنین هەوێنەکەی بگەڕێنینەوە بۆ ئەو کارەساتانەی بەسەرماندا هات و لەبەرامبەر دادگاو ڕای گشتی جیهانیدا وەکو دۆسییەیەك کرایەوە. بەر لەوەی بواری گوێگرتن لەشکایەتکاران و پارێزەرانی کورد بێتە پێشەوە. بەشێوەیەکی دروست و وەکو خۆی دەرکەوت ئەو کارەساتەی لەکوردستاندا لە١٩٨٨/٢/٢٢ بۆ ١٩٨٨/٩/٦ لەچوارچێوەی شاڵاوەکانی ئەنفالدا لەلایەن ڕژێمی عێراق بەسەر خەڵك و گوندو ناوچەکاندا هێنرا، بەوردی تیشکی خرایە سەرو. دڵنیایی بەخشیە زۆرینەمان؛ کەبەڵێ جگە لەخۆمان دەستەی داواکاری گشتی بەتایبەتی (کوردانە) لەچوارچێوەی یاسادا بەپشت بەستن بەبڕیارو ڕاسپاردەکانی خودی ڕژێمەکەو ئاماژەدان بەبوونی بەڵگەو دۆکیۆمێنت و کەرەستەی دەوڵەمەند لەدۆسیەکەدا

تۆمەتبارانواقووڕمانو لەبەرامبەر ئەو باسانەدا هیچ وەڵامێکی ئەوتۆیان نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا تیشك خستنە سەر جۆرو شێوازی ڕاگواستنو کۆکردنەوەو لەناوبردنی ئەو هەزارەها خەڵکە لەسەحراکانی جنوبو نزیك سعودییەو زیندە بەچاڵکردنیان، لەهەمان کاتدا پیشاندانی بەشێك لەحەقیقەتەکان بەوێنە، نیشاندەری ئەوە بوو کەبەڵێ ئەم دۆسیەیە پڕە لەبەڵگەی ئەوتۆ کەتاوانباران ئەوەندەی تر بەستە زمانو دەستەوەستان دەکات لەبەرگری لەخۆکردنیاندا. ئەوەش لەوەدا دەرکەوت لەو سەرەتایەوە بێدەنگیان هەڵبژاردو؛ لەبەرامبەردا پارێزەرەکانیان هیچ تانەو ڕەخنەیەکیان لەو دوو باسەی داواکارانی گشتی نەبوو. هێندە نەبێ وەکو پیشەی رابردوویان قسە لەسەر شەرعیەت بوونو ناشەرعیەتی دامەزراندنی دادگاکەو پێکهێنانی دادگاییەکی لەو جۆرە بکەن. ئەمە جگە لەوەی لەوەشدا ئەوەیان فەرامۆشکرد کەئەم دادگایە بەبڕیاری ژمارە (١٠)ی ساڵی ٢٠٠٥ی ئەنجومەنی نیشتمانی عێراق دامەزراوە؛ نەك لەلایەن بریمەرەوە. لەم سەرەتاییەوە دڵخۆشین بەوەی کەیسی ئەنفال وەکو ئەوەی لەکاتی خۆیدا وەك تاوانێکی بکوژێنە لەبێدەنگیەکی گەورەدا ڕوویدا، ئێستا لەفەزایەکی بەربڵاوی میدیایکو یاسایکو سیاسی گەورەدا سەدا دەداتەوە. بەجۆرێك دروستە بڵێین بەڵێ ئەمڕۆ ئەنفال بەتەواوەتی ویژدانی مرۆڤایەتی هەژاند.



# خوێندنەوەی مورافەعە

## سەرەتاییەکانی دۆسیەی سەدە

بیست و یەکی هەشت؛ ڕۆژێکی ئاسایی و ڕاگوزەر نەبوو. بەڵکو ئەو ڕۆژە دادگاییکردنی ڕژێم و سەرکردە بڕیاردەرەکانی بوو، کەچەندین تاوانی گەورەو بێوێنەیان لەمێژووی دەسەڵاتی خۆیاندا دەرهەق بەهاووڵاتی و خەڵکی بێدیفاعی کوردستان ئەنجامدا. بەتایبەتی بۆ کورد کەمزۆرترین چەرمەسەری و هەوڵی قڕکردنی دراوە؛ هەمیشە لەچاوەڕوانیی ڕووداوێکی لەو جۆرەیان دەکرد بەسەرەتایەکی چارەنوسسازو وەرچەرخێنەر تەماشا دەکرێت. چونکە بیست و یەکی هەشت ڕۆژی هەڵدانەوەی مێژووی پڕ لەمەزلومییەت و زام و قڕکردن و سوتاندن و زیندە بەچاڵکردنی خەڵکی کوردستان بوو.

کاتێک سەدام و عەلی کیمیاوی و گەورە بڕیاردەرەکانی ئەنفال لەنێو قەفەسی تۆمەتباریدا لەبەردەم دادوەری لێکۆڵینەوەو لەناو دادگای باڵای تاوانەکاندا بەتاوانی ئەنجامدانی شاڵاوەکانی ئەنفالی ساڵی هەشتاوهەشت، ڕووبەرووی لێپێچنەوە کرانەوە.

میدیاکانی جیهان و ئاژانسەکانی دونیاش راستەوخۆ بەپەخشکردنی مورافەعەکەو رەوشی دانیشتنەکان سەدای زیاتریان بەخشیە رووداوەکە.

هاو زەمانیش کەسوکاری ئەنفالکراوەکان بەخۆشحاڵیەوە پێشوازییان لەو چرکە ساتانەکرد. لەماوەی چاودێریکردنی دانیشتنەکانی دادگادا؛ چەندین تێبینی یاسایی و خاڵی دڵخۆشکەرو سەرنج راکێشەرو مەسەلەی نوێ بەدەرکەوتن و هاتنە پێشەوە. سەرەڕای ئەوەی لەرووی نیشتمانی و نەتەوەیی و نێودەوڵەتیی و سیاسی و یاساییشەوە. خودی دەستپێکی دادگاییەکە کاریگەریی هەمە لایەنەی هەیە.

رەوشی بەڕێوەچوونی دانیشتنەکان مایەی تێڕامانی وردو قسە لەسەرکردنن. بەر لەهەر ئاماژەدانێك ناتوانین ئەو وتەیەی سەرۆکی داواکاریی گشتی (جەعفەر موسەویی)، بەو پەڕیی بایەخەوەو بەگرنگ و لەهەمانکاتدا بە(کەمەر شکێن) ناوزەد نەکەین. کەبەمەبەستی ناساندنی دۆسیەی ئەنفال خوێندیەوەوە. لەدوتوێیدا چەندین وتەی جوانی نەبیستراوو، حەقیقەتی هێشتا نەوتراوو، وێنەو بەڵگەی زیندووی چاوەڕواننەکراوو، راستی بەیاسا مۆتوربەکراوو، دۆکیۆمێنتی بەهێزی، وەکو پوختەو نمونەی ناساندنی ئەنفال و پیشاندانی وێنەیەکی دروستی ئەو کارەساتە پێشکەش کرد.

دواتـــریش جێگـــری داواکـــاری گـــشتی (مـــونقز نالقمرعـــەون) بەناسـاندنی بڕیـارو راسـپاردەکانی سـەدام و عـەلی حەسـەن مەجید تایبەت بـەئامادەکاری بۆ ئەنجامدانی شاڵاوەکانی ئەنفال بابەتەکەی کـردەوە. هـەر لەبڕیاری ژمـارە (١٦٠)ی رۆژی ١٩٨٧/٣/٢٩ مجلس قیادە سـەورە؛ کەتیایـدا دەسـەڵات دەداتـە عـەلی کیمیـاوی بەسـەرۆکایەتی کردنی هەموو دامودەزگانی دەوڵەتی عێراقی لەسنوری کوردستاندا. دواتـر ئاماژەیـدا بـەبڕیاری ژمـارە (٤٠٠٨) ی رۆژی ١٩٨٧/٦/٢٠ کەعـەلی حەسەن مەجید ئاراستەی هەرسێ فەیلەقی جەیشی عێراقی کـردوە کەلەکوردسـتاندا بـوون. ناوەڕۆکەکەیـشی بەمەبەسـتی مامەڵەکردنـە لەگـەڵ گوندەکانـــداو نەهێـــشتنی بـــوونی مرۆییـــە تیایانـــدا؛ بەبـەکارهێنانی تـۆپ و فرۆکـەو هێلیکۆپتـەر بـۆ کوشـتنی زۆرتـرین ژمارەی دانیشتوانی گوندەکان.

ئەمـە جگەلـە ئیعدامکردنی هاووڵاتی لەتەمەنی( ١٥ ساڵەوە بۆ ٧٠) ساڵ دوای وەرگرتنی زانیاری لێیان. ئەم زانیاریانەو چەندینی تر؛ هەر لەناساندنی قۆناغە یەك لەدوای یەکەکانی شاڵاوەکانی ئەنفال. تا سـوتاندن و رووخانـدنی گونـدەکان؛ هـەموو ئەوانـەو بڕێکـی باشـترو دانـسقەتر لەبەڵگەی زینـدووی حاشـا هەڵنـەگر نـاوەڕۆکی بابەتـەکانی هـەردوو داواکاریی گـشتییان پێـك دەهێنـا. وەك بینیمـان بـەجیاوازی یەکـەم دانیـشتنی دۆسـیەی دوجێـل. هـیچ یـەکێك لـەتاوانباران نـەیانتوانی لەبـەردەم ئـەو هـەموو بەڵگـەو بابەتانـەی پێکهێنـەری

راپۆرتی داواکارانی گشتیدا، قسەیەك یان بەرپەرچدانەوەو قسە پێبڕینێك بكەن. لەكاتێكدا ناوی سەدامو عەلی حەسەن مەجیدو دوبارەو سێ بارە بووەوە، رەفتارەكانیان بەوەحشیگەرانەش ناوزەد كرا.

واتە دەستپێكی یەكەم دانیشتنی دادگایەكە بەو چەشنە؛ بەهێزو جێگەی دڵخۆشی بوو. لەوەش گرنگتر پارێزەرانی داكۆكیكار لەسەدام حسینو تاوانبارانی تر، وەك پیشەی پێشووتری دۆسیەی دوجێل؛ هاتنە سەر قسەكردن لەسەر پێكهێنانی دادگایەكەو بەناراستەی ناشەرعی بوونكو؛ بەچەند بیانوویەكی یاسایی بێ هێز دەیانویست تەعنی دادگایەكە بكەن. بەلام هەر زوو دادوەر ئەو دەورەی لێوەرگرتنەوەو، بیانوەكانیانی پوچەڵ كردەوە. خەلیل دلێمی بەدیوێكی تردا وەكو موەكیلەكەی، ئەویش خۆی لەو باسە پڕ بەڵگەیەی داواكارانی گشتی دزیەوەو، خۆی لەقەرەیان نەدا. هەرچەندە وەكو لەدۆسیەی دوجێلدا بینیمان، مشتومڕو قسەكردن لەسەر یاسایی بوون یا نەبوونی دادگای باڵای تاوانەكان چەندین دانیشتنی برد. بەلام لەم دۆسیەیەی ئەنفالدا هەر لەیەكەم دانیشتنو لەبەرایدا ئەو مەرامو بەلاڕێبردنی دادگاییەكە لەلایەن پارێزەرانی تاوانبارانەوە كرایە بڵقی سەر ئاو.

وەك هەڵوێستێكی دادوەرانەی بەرزیش كەتێبینی كرا، دادوەر (عەبدوڵلا عامری) رێگەی بەهەردوو پارێزەری ئەردەنیو میسری

ئـەدا راسـتەوخۆ وەكـو پـارێزەری بـەرگریی لـەتاوانباران دەستوەرخەلـە بكـەن. پێـی راگەیانـدن كەتـەنیا دەتـوانن وەكـو راوێـژكاری پارێزەرە عێراقییەكانی داكۆكیكار لەتۆمەتباران لـەناو دادگادا كار بكـەن. ئـەو یاسایەی دادگاییەكەی پێ دەبرێ بەڕێوە. دادوەر ئەو حەقەی نـەدانێو هەردوو پارێزەرەكە چوونە دەرەوە.

ئەم هەڵوێستە كاریگەریی نیجابێو بـەهێزی دروسـتكرد هـەم بـۆ رەوشی دادگاییەیەكەو هەم بۆ دۆسیەكەش.



## ئەنفال لەتەرازووی

## دادگای نیشتمانیی‌و نێودەوڵەتیدا

بەر لەدامەزراندنی دادگای باڵای تاوانەکان لەعیراق‌و پاشتریش، گفتوگۆو باس‌و خواستی دادگاییکردنی تاوانبارانی شاڵاوی ئەنفال لەدادگایەکی ناوخۆیی نیشتمانییدا؛ یان دادگای نێودەوڵەتیدا کامیان بەقازانجی دۆزی کوردو سزای رەوای تاوانباران دەکەوێتەوە. هەندێك بۆ ئێستاش پێیان وابوو بۆ زیاتر گەیاندنی دەنگ‌و دۆزی کورد بەجیهان‌و؛ ناساندنی تاوانەکانی دژ بەخەڵکی کوردستان بەدونیاو؛ گواستنەوەی کێشەکان بۆ نێو مەحفەلی نێودەوڵەتی، دادگاییکردنی تاوانباران لەدادگای نێودەوڵەتیدا باشترە ئەنجام بدرێت.

لەلایەکی ترەوە رای فرەلایەن و بەهێزیش ئەوەبوو؛ لەناوخۆدا تاوانباران دادگایی بکرێن. چونکە دادگای عیراقی دەرفەتی سزای ئیعدام‌و توندترین سزای تێدایە، دەرهەق بەتاوانباران بدرێت.

ئەمە جگەلەوەی بۆ سارێژبوونی برینی خەڵکی کوردستان‌و عیراق‌و؛ گێرانەوەی سەنگ‌و سەروەریی بۆ دەسەڵاتی یاساو حوکم لەعیراقدا دادگایی ناوخۆییان لا پەسەندتر بوو.

ئەمە جگە لەوەی هێزە سیاسیەکان بەتایبەتی کوردو شیعە لایان گونجاوتر بوو لەعیراقدا تاوانباران دادگایی بکرێن. ئاکام بەپاساو بڕیاری عیراقی مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت.

بەرێژەیەکی کەمیش کەنەبووە جێی مشتومڕ مەترسی ئەوەش لەئارادا بوو؛ رەوت و ئاراستەی سیاسی و بەرژەوەندییەکان و فشاری چاوەڕوان نەکراو دروست ببن؛ یان لەعیراقدا جۆرێك لەگۆڕانکاریی بەسەردابێت و دادگایی تاوانباران بکرێتە سیناریۆیەکی سیاسی.

دیارە دامەزاندنی دادگایەکی نێودەوڵەتی بۆ تۆمەتباران لەهەموو حاڵەتێکدا پێویستی بەرەزامەندیو بڕیاری نێودەوڵەتی هەبوو، بەتایبەتیش ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی، ئەوەش بەهۆی هەڵوێستی ناڕوونی چەند وڵاتێکی وەکو روسیاو چین و فەرەنساو چەند وڵاتێکی تر، ئەو ئەگەرە بەزەحمەت دەخوێنرایەوە. لەوانەش بوو ماوەیەکی زۆر زیاتر بخایەنێت بۆ مصادەقەکردن لەسەر دروستکردنی دادگاکە.

وەك زانراوە لەدوای جەنگی جیهانی دووەمەوە؛ بیرۆکەی دروستکردنی دادگای نێودەوڵەتی بۆ تاوانە گەورەکانی دژ بەمرۆڤایەتیو تاوانی جەنگو جینۆساید هاتنە کایەوە. لەوانە دادگای نێودەوڵەتی تۆکیۆو، دادگای نێودەوڵەتی نۆرمبێرگ. ئەم دوو دادگایە نەیانتوانی ئەزموونی دادگای نێودەوڵەتی بەتەواویی و لەئاستی پێویستی جیهانیدا بچەسپێنن. هەروەها لەسەرەتای

نەوەتەکانی سەدەی رابردووشەوە دادگای لاهای بۆ تاوانبارانی شەڕی یۆگسلافیا دروستکرا. لەو دادگایەدا تەنیا (سلۆدان میلۆسۆڤیچ)ی تێیدا درایە دادگا.

لەم روانگەیەوە دەبینین دەرئەنجام دادگای باڵای تاوانەکان لەعیراق لەلایەن رای گشتی ناوخۆییەوە، پێشوازی یاسایی‌و جەماوەریی لێکرا. بەتایبەتی دوای دەرکەوتنی تاوانباران لەبەردەم دادگاداو ئەو تاوانانەی کەئەنجامیان داوە، لەچوارچێوەی تۆمەتدا رووبەڕوویان کرایەوە.

لەو پێناوەشدا بەوردییەوە میدیاکانی جیهان‌و ناوەندە جیاجیاکانی مافی مرۆڤ‌و رێکخراوە یاساییەکان‌و چاودێرانی سیاسی‌و دەوڵەتان چاودێری‌و موتابەعەی بەڕێوەچوونی دانیشتنی دادگاییەکەیان کرد.

لەو سەرەتایەشەوە دادگا توانی سەنگ‌و سەروەریی خۆی بپارێزێ‌و؛ لەهەمان کاتدا وەك تۆمەتبارێکی ئاسایی لەگەڵ گەورە دیکتاتۆرو دەسەڵاتدارە زلەکانی دوێنێی عیراقدا مامەڵە بکات.



# دۆسیەیەکی پڕ لەبەڵگە

دوای چاوەڕوانیەکی زۆری چەندەها ساڵە، دواجارو بۆ یەکەمین جار لەسەر تاوانێك لەو تاوانانەی رژێمی بەعس لەعێراق دەرهەق بەخەڵك و خاکی کوردستان ئەنجامیدا؛ ئەنجامدەرانی رووبەڕووی دادگاو لێکۆڵینەوە دەکرێنەوە.

٨/٢١ ئەو رۆژەیە کەتەواوی دونیا بەگشتیو خەڵکی کوردستانو کەسوکاری قوربانیانی ئەنفال بەتایبەت؛ بەتێرامانی وردو تاسەوە دەیانەوێ راستەوخۆ لەکەناڵە جیاجیاکانەوە تۆمەتباران لەنێو قەفەسی دادگای باڵای تاوانەکاندا ببینن.

واتە ٨/٢١ رۆژی داداگایی کردنی سەدامو عەلی کیمیاویو دارودەستە سەرەکیەکانە بەتاوانی ئەنجامدانی کارەساتی ئەنفال.

ئەمەش بۆ خۆی رووداوێکی گرنگی پڕمەغزاو مێژوویی دەبێ. چونکە دۆسیەی ئەنفالو رووبەڕووکردنەوەی تاوانباران لەبۆتەی

دادگایەکی نیشتمانی کراوەدا، لەگەڵ خۆیدا چەندەها نهێنی و رووداوی هێشتا شاراوەو تاوانی باس لێنەکراوو نەدیتراو ئاشکرا دەکات.

کلیلی کردنەوەی چەندەها لایەنی تری نادیارو چاوەڕوان نەکراویش دەبێت.

لەگەڵ ئەوەشدا دەروازەیەکی یاسایی فراوانیش دەخاتە سەرپشت بۆ تێکڕای کۆمەڵگای مرۆڤایەتی و ڕێکخراوەکانی داکۆکیکار لەمافەکانی مرۆڤ و ناوەندەکانی دژ بەتاوانی جینۆساید بۆ وردبوونەوە لەتاوانێکی هێندە گەورە.

لەگەڵ بەرێوەچوونی رۆژانی دادگاشدا بەئاگا هاتنەوەی ئەوانیشە؛ لەخەمساردی و بێدەنگبوونیان لەقوڵترین برینی جەستەی نەتەوەیەک.

لێرەوە بەمەبەستی خستنە رووی چەند دیوێک لەمەسەلەی پەیوەست بەدۆسیەی ئەنفال و دادگایی سەدام و دارودەستەکەی؛ بەم نەفەسی نوسینەوە تابەردەوامی دادگا تیشک دەخەینە سەر زیاد لەلایەنێکی پێویست بەو رووداوە گرنگ و مێژووییە، کەبۆ کوردو خەڵکی کوردستان بایەخ و کاریگەریەکی ئێجگار گەورەی سیاسی و یاسایی و ئەخلاقی بەجێ دێڵێ، بۆ نەیارانی دۆزی کوردیش دەرس و پەندی گەورە هەڵدەگرێ.

بەخوێندنەوەیەکی تر دەتوانین ئەو راستیەش بسەلێنین کەبیستویەکی هەشت رۆژێکی نوێ و سەرەتایەکی باش دەبێت

لەبەدیهاتنی ئاواتەکان و؛ هەروەها دەرفەتی رەخساوتر بەمبازیانی بۆ گەیشتن بەئامانجەکانی تر. لەبەر ئەوە ئامادەباشیی و چاودێری کردنی هەنگاو و دەنگۆکانی رۆژانی داد؛ پێویستیەکی لەرادە بەدەری راگەیاندنەکان و چاودێرانی سیاسیی و یاسایی و گشت لایەنەکمانە. تا بەئاکام گەیشتنی دۆسیەی ئەنفال لەدادگادا.



# پارێزەرانی کورد

لەو دانیشتنانەی بەرایی دادگادا، لەبەر ئەوەی زۆر بەدیقەتو وردیەوە چاودێری بەڕێوەچوونی مورافەعەکان دەکرا، بەشێکی زۆر لەو تێبینیانەی لەسەر دادوەرو تاوانباران‌و داکۆکیکارانو؛ ئینجا سکالاکەرو پارێزەرانی کورد هەبوون، پڕ بوون لەراستکو؛ خەمخۆرانو نوسەران، لەرۆژنامەو کەناڵەکانی راگەیاندنەوە بەوریاییەوە قسەیان لەبارەوە کرد.

ئەوەی گرنگە لێرەوە ئاماژەی پێبدەین؛ رۆڵو ئامادەیی پارێزەرانی داکۆکیکارە لەسکالاکەرە_شایەتحاڵەکان. چونکە ئەوان دەتوان دەورێکی گەورە لەدەمکوتکردنو دەرنەچوون لەدۆسیەکەو چێوەی یاسایی بەخشین بەوتەو داواو سکالای شایەتحاڵەکانو، هێزێکی زیاترو وزەی باشتر ببەخشنە بەڵگەو تاوانەکانی تاوانباران.

واتە لەسەر هەڵەو کەموکورییەك کەبووە، دەشێ ببێتە هێمای پێداچوونەوە، چونکە وەك مەعلومە دانیشتنەکان درێژخایەن دەبنو

تا داهاتوویەکی دوور بەردەوام دەبن. بۆیە بۆ هەر هەڵەیەکی دووبارە نەبونەوەو تێنەپەڕین بەسەریدا پێویستە.

بەدیوەکەی تردا هەر سوکایەتیکردن و (استفزاز) کردنێکی شایەتحاڵەکان لەلایەن تاوانباران، یان پارێزەرەکانیانەوە، جگەلەوەی کاریگەریی دەروونی خراپ لەسەر شایەتحاڵەکان دروست دەکات، لەهەمان کاتدا دەستدرێژیی کردنە بۆ سەر کەسایەتی خودی شایەتحاڵەکان و، ئیستفزازکردنی میللەتێکیشە. چونکە ئەنفال ئەنفالکردنی نەتەوەیەك بووە.

ئەو بیانوەش لاوازە یەکێك لەپارێزەرەکان بەو جۆرە پاساو بێنێتەوە، کە ئەوان خۆیان ناخەنە ئەو ئاستە نزمەی پارێزەرانی تاوانبارانەوەو وڵامیان بدەنەوە.

هەرچەندە بۆ وەڵادانەوەی ئەو دەربڕینە دوور لەپاساییانەی پارێزەرانی تاوانباران و؛ دەرچوونیان بۆ دەرەوەی بابەتی دەعواکە شێوازو دەستەواژەی پاسایی بەهێز هەیە بۆ ڕەتدانەوەو ئیست پێکردنیان.

ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە وەك زانرا بۆ دانیشتنەکان (شەش) پارێزەر ئامادە دەکران، بەڵام لەهەر دانیشتنێکدا سێ لەپارێزەرەکان بۆیان هەبوو بچنە ژوورەوە. سێ پارێزەرەکەی تریان لەدەرەوەی هۆڵەکە بوون و، لەدانیشتنی دواتردا لەسەر هەمان بابەت ئاڵوگۆڕیان بەجێگاکانیان دەکەن!. ئەو حاڵەتەش دەبێتە مایەی

بچڕاندنی زانیاریو ئاگایی لەوردو درشتی دانیشتنەکان لای پارێزەران. هەرچەندە یەکێکی تر لە پارێزەرەکان لەبەرنامەیەکدا وتی: داوامان کردوە کورسیمان بدەنێ دادوەرو دادگا رازی نەبوون.

بەڵام پرسیارەکە لێرەدایە: ئایا نەدەکرا ئیعتراز بگرن‌و داکۆکی بکەن کەدەبێ هەر شەشیان ئامادەییان هەبێ؟و فشار بخەنە سەر ئیدارەی دادگا؛ لەکاتێکدا یاسا ڕێگەیان دەداتێ.

بۆچی بۆ داکۆکیکەرانی تاوانباران ڕەوا بێ؛ کورسی ریزکرا بێ‌و زیاد لەهەشت‌و دە پارێزەریش لەناو هۆڵی دادگادا ئامادەییان هەبێ. بۆ پارێزەرانی کورد ڕەوا نەبێ.

لەکاتێکدا دادگا دەبێ بەتەواوی‌و یەکسانی حورمەتی پایەو پێگەی پارێزەرانی کوردو ژمارەیان بگرێت.

کەواتە لەدانیشتنی چوارەم‌و دواتردا هەمووان ئەوجی وریایی‌و هوشیاریی یاسایی دەمو دەستی پارێزەرانی کورد چاوەڕوان دەکەین بەمزاڵبوون بەسەر ئەو کەموکوڕییانەی لەدانیشتنەکانی پێشوتردا هەستیان پێدەکرا.



## ئەو کەناڵانەی

## دادگاییەکەیان پەخشنەکرد

لەپاڵ ئەو کاریگەرییە سیاسی و یاساییە ئیجابیانەی دادگایی کردنی تاوانبارانـدا کەهەیە. بایەخپێـدانی کەناڵـەکانی راگەیانـدن بەگشتی و کەناڵـە فەزاییـەکانی سـەتەلایت بـۆ زیـاتر ناسـاندن و ئاشناکردنی دونیا بەکارەساتەکەو رووداوە و یـژدان هەژێنـەکانی نـاو کارەسـاتەکە؛ بـۆ خـۆی دیـوێکی کاریگـەرو سـەرەکی تـر بـوو. بەتایبەتیش بۆ ئەو کەناڵانـەی بەجدییەتـەوە گرنگی دەدەنـە مـرۆڤ و زانستیانە راگەیاندنی راست و دروستییان کردۆتە پەیام.

بێگومـان بـەو پێیـەی هێـشتا بەشـێك لەعەقڵیـەتی شـۆڤێنی و بیرتەسکی عەرەبی سەدام و حیزبی بەعس بە سەر راست و پاڵەوانی عروبـە دەژمێـرن. لایـان گـران و سـەختە حەقیقـەتی خـۆ ئاسـای

رژێمەکەو سەدام و دارو دەستەکەی بەو جۆرەی کەهەبوو ئێستا لەنێو قەفەسی تاوانبارییدا بەزەلیلی لەبەرامبەر کردەو تاوانی گەورەی وەکو ئەنفال کەئەنجامیانداوە، لەدادگای عیراقیدا لەرێگەی ئاژانسەکانی دەنگوباس و تەلەفزیۆن و کەناڵەکانی تری راگەیاندنەوە ببینرێن.

ئەو راستیەش لەیەکەم ساتەوەختەکانی دادگاییەکەوە بەڕوونی هەستی پێدەکرا. وەك چۆن بەشێکی زۆر لەکەناڵە عەرەبییەکان خۆیان دزییەوە لەپەخشکردنی ئەو رووداوە گرنگ و هەستیارە، هۆکاری خۆ دزینەوەشیان روون و دیارە، جێگەی سەر سوڕمان و گازندەیی رای گشتی کوردستانیش نییە.

ئەو خۆلادانە هێندەی تر حەقیقەتی ئەو عەقڵیەت و دەرخەرەوەی ئەو بیرکردنەوانەن کەهێشتا گوێی خۆیان لەبەرامبەر ژان و ناڵەی نەتەوەی کورددا ئاخنیوە! نایانەوێ رووی راستەقینەی پاڵەوانە وەهمیەکانیان پیشانی رای گشتی خۆیان بدەن.

جگە لەوەی کەناڵە ئاسمانییە تورکی و ئێرانییەکان بەهەواڵیش باسیان لێوە نەکرد، ئەوەی مایەی نیگەرانی قووڵە، کەناڵە کوردیەکانی وەکو( رۆژ و تیشك و کۆمەڵەو مید) راستەوخۆ پەخشیان نەکرد، رۆژی رووبەڕوو بونەوەی کورد و دادگاییکرنی بیری شۆڤێنی عەرەبییان نەگواستەوە.

پێشتر ئامادەباشیان بۆ ئەو رووداوە گرنگە نەکردو لەبەر هیچ نەبێ بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو تەعتیمە ئیعلامیەی کەناڵە عەرەبیەکان کاریان پێی کرد.

وەکو بەرپرسیارێتیەکی ویژدانیو نیشتمانیو نەتەوەیی، دەبوو خوێندنەوەیان بۆ ئەو دادگایە هەبووایە. کەلەخۆیدا پەیامێکیشە بۆ ئەو دەوڵەتو دەسەڵاتانەی کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە. بۆ ئەوەی وەك دەرسو پەند سودی لێوەرگرنو سەدام ئاسا مامەڵە لەگەڵ کورددا نەکەن.

خوازیارم لەدۆسیەکانی تری تاوان کەدەرهەق بەکوردو کوردستان کراون و لەموراففەعەکانی دادێ کەناڵە ئاسمانییە کوردیەکان ئەم دەرفەتە لەدەست نەدەنو، بەپەخشکردنی سەرلەبەری دانیشتنەکان ئەو گلەییانەی رابردووش بسڕنەوە.

چونکە تا شاشەی زۆرترو کەناڵی زیاتر ئەو دادگاییەی سەردەم پەخش بکات، خزمەتی زیاتر بەپاراستنی مافەکانی مرۆڤو دەرخستنی پەیامی راستی دەگات. ئاسانتریش رووی ناشرینی دیکتاتۆریەت لەعیراقو، مەزڵومییەتی کوردو، گەورەیی تاوانی ئەنفالیش بەدونیا دەناسێنێ.



## رژێمی ئەنفال

لەساتەوەختی کودەتای هاتنە سەر حوکمی دەسەڵاتەکەیەوە؛ تا رۆژی کەوتنەوەی پەیکەرەکەی جەللاد، ناوو پێناسەی زۆر بۆ دەسەڵاتی بەعس کراوە.

هەر کەس و ناوەندێك لەسەر بنەمای خوێندنەوەی رەفتارو بەرنامەکانی رژێمەوە ئەو ناوەی بەباڵادا بڕیوە.

خودی رژێمەکە لەبەر ئەوەی بەکودەتاو زۆرداریی چەك و چەقۆو پیلان، لەساتەوەختی خۆیدا هاتە سەر حوکم. لەماوەی دەسەڵاتدارێتی خۆیشیدا بەو کەرەستانە پارێزگاری لەکورسی دەسەڵاتەکەی کرد، بۆیە کەباس دێتە سەر ناوهێنانی رژێمەکە ئەو ناوەی پێویستە بۆ دەوڵەت و حکومەتێکی ئاسایی بکرێت، بۆ رژێمی بەعس و دەسەڵاتی سەدام حسێن لەعێراقدا، ناوی جۆرو جیاواز لەخۆ دەگرێت و، بۆ گوزارشتکردن لەدەرخستنی حەقیقەت و پیشاندانی ماهییەتی راستەقینە، یان بەشێوازێکی تر ناوێك کەپڕاو پڕبێ بەپێناسەو کارنامەو بەرنامەی رژێمەکە لەماوەی سێو پێنج ساڵی

بەڕێوەبردنی عێراقدا، لەمزۆر رەهەندی واقیعی بووەتە ناوەکان سەرچاوەیان گرتوە.

هەندێك لەو ناوانەی زەق و زۆر ناسراون. بریتین لە (رژێمی دیکتاتۆری، رژێمی گۆڕە بەکۆمەڵەکان، رژێمی جینۆساید، رژێمی شەر، خوێن، چەقۆ، دەسەڵاتی ئیبادەی جەماعی، کۆماری ترس و مەرگ، رژێمی تەعریب، فاشی، تەبعیس و..هتد).

هەموو ئەو ناوانەو چەندینی تر پڕ بەپێستن؛ بۆ پێناسەی رژێمی بەعس لەعێراقدا.

هەر یەکێك لەو ناوانە بەشێکن لەپێناسەی ئەو دەسەڵاتەو سەراپای پێکهاتەو ستراکتۆرەی رەفتارو هەڵسوکەوتەکانی، لەلایەن دامودەزگا گەورەو بچوکەکانیەوە. هەر لەسەرۆکی وڵات تادەگاتە سەربازێکی ئاسایی و جاش و بەکرێگیراوەکانیشیان، بۆ خۆی گوزارشتکەر بووە لەو نازناوانەی پڕ بەباڵای ئەو دەسەڵاتەیاندا براوە.

بەپێچەوانەی ئەمەشەوە ئەدەبیاتی بەعس هەمیشەو چەواشەکارانە سەرۆك و رژێمەکەی بە (فریاد رەسی مرۆڤایەتی، رەحمەتی خودایی، پاڵەوانی ئەفسانەیی، سیمبولی ئاشتی و قارمانی عروبەو ..هتد.) ناساندوەو پیشانداوە.

رای گشتی کوردستانی و عێراقی و بەم دواییانەش جیهانی، لایان وایە هەموو ئەو دەستەواژانەی لەتاوان و قڕکردن و جینۆسایدکردنەوە سەرچاوە دەگرن، هێشتا ناوو پێناسەیەکی دروست و پڕبەپێست بۆ

رژێمی عێراق نادەنە دەستەوە، چونکە ئەو رەفتارانەی دژ بە مرۆڤو مافەکانی لەناو وڵاتو دراوسێکانیدا پیادەی کردووە، هەمووی پەیماو بەنـــدە یاســـاییەکانی پاراســـتنی مـــافی مـــرۆڤو پەیماننامـــە نێودەوڵەتیەکانی نەك هەر پێشێل کردوە، بەڵکو بەتەواوی لەدژیاندا رووبەڕوو بۆتەوە.

ئەو چەندین دۆسیەیەی بەدوای یەکدا لەدادگای باڵای تاوانـەکانی عێراقیـدا ئەنجامـدەرە سـەرەکییەکانی پـێ رووبـەڕوو دەکرێنـەوە، بەجێیی ئەو دەستەواژەو نازناوانە دەسەلمێننەوە.

(رژێمـی ئـەنفال)یـش لـەو نـاوە کوردەواریانـەن بەعـسی پـێ دەناسرێتەوە.

لەبـەر ئـەوە پێویـستە لێـرەوەو تاکۆتـایی دۆسـیەی ئـەنفال لـە دادگاییەکـەدا هـەموو کەناڵـەکانی راگەیانـدنو ناوەنـدە یاسـاییو سیاسییەکان بەو نازناوە ناوی رژێمی بەعس ببەن.



## ئەنفالو راگەیاندنەکانی بەعس

بــەعس راگەیاندنەکانیــشی ئەگــەر لەشــاڵاوە ســەربازییو ئیستخباراتییو لۆجستیکیەکان زیاتر؛ رۆڵی چرو پڕی لەسەر ئەنفالو زەمینــە بــۆ خۆشکردنی نەرەخــساندبێ، ئــەوا کــەمتری نەکردوە.

واتە یەکێك لەو کەناڵە سەرەکیانەی بەوردی لەپاڵ لایەنەکانی تردا ئیشی لەسەر ئەو کارەساتو تاوانانە کردبێ، دەزگاکانی راگەیاندنی رژێم بوو.

بەگەڕانەوە بۆ رووپەڕی رۆژنامەو گۆڤارو تەلەفزیۆنەکانی ئەو سەردەمە راستیەکە بەڕوونی دەبینرێ.

لەوەشەوە تێدەگەین بەئاشکرایی و بەشێوەیەکی رەسمی دانیان بەهێرشەکانی ئەنفالدا ناوە. بەتایبەتیش بۆ هەر قۆناغێك لەو هەشت قۆناغەی شاڵاوەکانی ئەنفال بۆ سەر کوردستان؛ بەیاننامەو راگەیەنراویان دەرکردووەو. دامودەزگاکانو خەڵکیان لەئاکامی هێرشو بەرەو پێش چوونی هەڵمەتە سەربازییەکانیان ئاگادار کردۆتەوە.

بڵاوکردنەوەی ئەو نوسراوانە لەکەناڵە بینراوو بیستراوو نوسراوەکانەوە، سەلێنەری ئەو حەقیقەتانەن کەرژێمەکە بێ

سلکردنەوە لەهیچ دەزگاو ڕێکخراوێکی جیهانیو مافەکانی مرۆڤو سیاسەتی نێودەوڵەتیو یاساکانی پاراستنی مرۆڤو مافەکانی ئەنجامدانی پەیماننامەی ساڵی ١٩٤٨ ی نەتەوەیەکگرتووەکانیش، ئەو تاوانانەی لەژێر ناوی ئەنفالدا بەئەنجام گەیاندوە.

ئەمەش بۆ خۆی نکۆڵی نەکردنو دان پیانانێکی پێشوەختە بۆ ئەنجامدەرانی شاڵاوەکانی ئەنفال.

بێگومان لەدادگاییەکەشدا بەڵگەیەکی کاریگەری بەهێز دەبێتو کاری خۆی دەکات..

جگە لەو ساڵەش (هەشتاو هەشت) کەکارەساتەکەی تیادا ڕوویدا.

لەوە بەدوا تا ڕووخاندنی ڕژێمەکە، ساڵانە کەرنەڤاڵی سەرکەوتنو یادی ئەنفالیان دەکردەوە؛ وەك پاڵەوانێتیەك لەئەدەبیاتی بەعسو ڕژێمەکەدا ڕەنگی دابوەوەو خەڵاتی بەشداربوانیان دەکرد.

ئەوەی ڕاستی بێ، ئەنفال لەدیارترین دیاردەکانی پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ تۆمارکراوە. ڕەنگدانەوەی ئەو تاوانانەش لەڕاگەیاندنەکانی ڕژێمدا بۆ دۆسیەکە کاریگەری هەیە.

لەو ڕووەوە نمونەیەکی بەرجەستە لەو چەندەها بەڵگە ڕاگەیەنراوە کەخستنە پێش چاوی گەرەکە. یەکێك لەوانە بەیانی ژمارە (٣٠٨٧) ە کەلەرۆژی ١٩٨٨/٢/١٩ لەهەموو دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە

خوێندرایەوەو بڵاوکرایەوە. کەباس لەکۆتایی قۆناغی یەکەمی ئەنفال دەکات.

هەرهەمان ڕۆژ بروسکەی پیرۆزبایی (سوڵتان هاشم) فەرماندەی هێرشەکانی ئەنفال یەك بۆ سەدام حسین بڵاوبوەوە، ئەمانە لە ژمارە (٦٥٠٨) ڕۆژنامەی (الثورة)و ژمار (٩٥٩)ڕۆژنامەی هاوکاری، بڵاوبۆتەوە.

بەهەڵدانەوەی ڕۆژنامەکانی هاوکاری عێراقو جمهوریەو الثورة، لەگەڵ گۆڤارەکانی ڕۆشنبیری نوێو ڕەنگینو ئەلف بایش چەندەها کەرەستەی سودمەند بەم دۆسیە دەست دەکەون. بەوەش زیاتر دەردەکەوێ چۆن ڕژێم میدیاکانیشی بەبەرنامەی ڕۆژنامەوانیو ڕاگەیاندنی ئاراستەکراوەوە ڕوومالّی شاڵاوەکانی ئەنفالی کردوە.



# چارەنووسی قورئان و مزگەوتەکان لەئەنفالدا

رەگ و ریشەی وشەی (ئەنفال)، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێش ئیسلام.

لەرووی مێژووییەوەو بنەڕەتی بەکارهێنانی لەناو کەلتوری دەوارنشین و خێڵی عەرەبدا رسکاوە. لەناو فەرهەنگی زمان و ئەدەبیاتی عەرەبیشدا بەر لەهاتنی ئاینی بوونی هەبووە.

بۆ نمونە لەبەیتە شیعرێکی شاعیری سەردەمی جاهلی عەنتەرەی کوڕی شەداد، ئەو وشەیە هاتووە کەدەڵێ:

"انا اذا حمس الوغى نرمي القنا
ونعف عن تقلسم الانفال"

لەرووی زمانەوانییەوە ئەنفال جەمعی وشەی (نفل)ە کەبەمانای (زیادە) دێت.

بەڵام بەهاتنی ئیسلام و بەتایبەتی لەدوای شەڕی بەدر کە بە رۆژی فرقان ناسراوە. لەناو ئەدەبیاتی ئیسلامیدا ئەم وشەیە زۆرو

زیاتر دەناسرێ. بەتایبەتیش کاتێک وەکو سورەتێک لەسورەتە پێکهێنەرەکانی قورئان دەبینرێ.

ئەگەر وشەی ئەنفال‌و بەتایبەتیش شەڕی بەدر کەبەسەرۆکایەتی پێغەمبەر بەڕێوەچووە، بۆ پارێزگاری لەمانای ئیسلام‌و وتەکانی خوداوەند بووبێ، ئەوا لەسەر دەستی رژێمی بەعس لەعێراق‌و سەدام حسێندا. ئەم وشەیە بەتەکنیک‌و ئایدۆلۆژیای بەعس بەکارهێنراو بەئاراستەیەکیتر. ئەویش بەرامبەر نەتەوەیەک کەکوردەو لەمێژووی دوورو نزیکدا خزمەتی گەورەی بەکەلتورو مێژووی ئیسلام کردوە بەجۆرێک گەر زێدەڕۆیی نەبێ، عەرەب خۆیان هێندە پارێزگاریان لێنەکردوە، بەرامبەر بەکۆمەڵێکی بێدیفاع‌و بێچەک‌و لەناو ئەم شالاوانەشدا کەلەژێر ناوی ئەنفالدا کرایە سەر کوردستان، سەدان مزگەوت لەگەڵ روخاندنی گوندو شارۆچکەکاندا توشی بۆمباران‌و دواجار روخاندن‌و تەخت کردن هاتن.

بەهەزاران کتێبی قورئان و بەرماڵی نوێژ بوونە ژێر دارو پەردووی سوتاوی ماڵ‌و خانووی گوندنشینان‌و بەرەکانیان سوتێنران‌و دران.

ئەوەی مەبەستە لێرەداو لەمێژووی کۆن‌و نوێدا نمونەی کەمە، ئەوەیە، رژێمی عێراق تاکە رژێمێکە لەدونیادا زۆرترین زیانی لەماهیەتی ئیسلام دابێ. بەتایبەتیش کەقسە دێتە سەر تاوانەکانی ئەنفال، دەبینین قورئانی پیرۆزو مزگەوت‌و تەکیەو خانەقاو

مەرقەدەكان بەجۆرێك دەستدرێژیان كراوەتە سەر، هیچ ناكارێك هەڵی ناگرێ. بۆیە لەمەشدا ئەو رژێمەروەك چۆن ناوی كەوتۆتە مێژووەوە وەك خەتەرناكترین رژێمی دژبە مرۆڤایەتی لەمێژووی هاوچەرخ و سەردەمی مۆدێرنەدا، ئاوەهاش بەبەكاهێنانی وشەی ئەنفال و دواجار دەستدرێژی كردنە سەر پیرۆزیەكانی ئیسلام لەشالاوەكانی ئەنفالی هەشتاوهەشتدا، ئەوەی پێ دەبڕێ وەك رژێمی دژە ئاین و مزگەوت و تەكیەو خانەقاكان ناوی بچێتە مێژووەوە.

لەم رووەوە ئەركی زانایانی ئاینكو مەرجەعیەتە دینیەكان و ناوەندە ئیسلامیەكانە بۆ ئەم دادگاییە هەڵوەستەو چاودێرییەكی جدی بكەن و؛ لەمێستەوە گوتارەكانی رۆژی هەینییان تەرخان بكەن بۆ قسەكردن لەسەر ئەو مەسەلەیە.



## هێزی دۆکیۆمێنت

واچاوەڕوان دەکرێ دۆسیەی ئەنفال لەدادگایی جەلادو داروودەستەکەیدا، پڕ بێ لەبەڵگەو دۆکیۆمێنتی بەهێزو سەلمێنەر بۆ ئەو تاوانانەی لەشاڵاوەکانی ئەنفالدا بەعس لەکوردستاندا ئەنجامی داوە.

چونکە تاڕاستێکی باش کارکراوە بۆ کۆکردنەوەو ئامادەکردنی شایەتحاڵ و نوسراوی رەسمی لەبڕیارو رێوشوێنی ئەنجامدانی پرۆسەکە. باشترین کەرەستەش لەبەردەستدا بێو لەکاتی خۆیدا بەتواناو خەمخۆریی خەڵکی کوردستان و لایەنە سیاسیەکان کۆکرابێتەوەو پارێزرابن، ئەو شانزە تەن بەڵگەنامەی دامودەزگاکانی رژێمە، کەلەراپەڕینی ساڵی ١٩٩١ دا گیران و، دواتر رەوانەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کران.

لەوێشەوە درانە رێکخراوی چاودێریی مافی مرۆڤ لەو ولاتە (میدل ئیست ووچ) یش بەگەیشتنی بەڵگەنامەکان کەپێنج ملیون لاپەڕەی هەمەلایەنیە کاری لەسەریان کرد.

لەسەرەتادا بەمەبەستی ئامادەکردنی فایلێك بۆ دادگایی کردنی سەرانی رژێمی بەعس لەدادگاییەکی نێودەوڵەتیدا بەتاوانی جینۆسایدی کورد، چەند ستافێکی کاریان پێك هێنا.

ئەو سەردەمە چەندین لێکۆڵەرەوەو شارەزای کوردو عێراقی بانگهێشت کران، بۆ پشکنینی بەڵگەنامەکان و (٢٥) کەسیان لەوانە کورد بوون.

بەو مەبەستەش لەرووی مەیدانییەوە رێکخراوەکە تیمێکی لەبەشی رۆژهەڵاتی رەوانەی کوردستان کرد (هیومان رایت وۆچ)، بەمەبەستی زیاتر ئاشنا بوون و شارەزابوون، بەو کارەساتانەو ئاسەوارەکانی. هەرچەندە ئەو مەبەستەی رێکخراوەکە هەیبوو کەلە ئایندەدا لەدادگاییەکی نێودەوڵەتیدا ئەو دۆسیە بکاتەوە سەری نەگرت. بەڵام بۆ ئێستا ئەم دادگا نیشتمانییەی لەعێراقدا ئەنجام ئەدرێت؛ ئەو بەڵگەنامانە لەبەردەستدان و لەکاتی پێویستو یەکلاکەرەوەدا سودیان لێ دەبینرێ.

بەشێکی زۆر لەو بەڵگەنامانە هەر لەبڕیارو راسپاردەو ئەنجامی رەفتارە نوسراوەکانی دامودەزگا سەربازیو ئەمنیو حزبییەکانی رژێمەکە نوسخەی ئەسڵین و، بەئیمزای تەرو مۆری تەڕەوە دەست کەوتوون.

ئەمە جگە لەوەی لەچەند کاتێکی جیاوازو رێگەی ترەوە بەڵگەی جۆراو جۆرو سودبەخش بۆ بەهێزکردنی دۆسیەی ئەنفال لەدوای راپەڕینو دواتریش دوای پرۆسەی ئازادی عێراق دەستکەوتوون..

هەموو ئەوانە تێکڕا لەگەڵ ئەو شایەتحاڵانەی لەدانیشتنەکاندا ئامادە دەبنو سکاڵایان تۆمار کردوە. دۆسیەی ئەنفالیان پڕ بەڵگەو

دۆکیۆمێنت کردوە. لەکاتێکدا هێزی تاوانەکە یەکسەر، هێزی یاسایی دیاری دەکات.

ئەنفالیش بەپێی خوێندنەوەی یاساناسان و چاودێرانی یاسایی هەمەلایەن و پڕ بەڵگەی حاشا هەڵنەگرەوە، تۆمەتباران لەبەرامبەریاندا زۆرتر بەستە زمان دەبنەوە، چونکە خودی سەدام حسێن و عەلی حەسەن مەجیدیش لەچەندین بۆنەی جیاجیادا دانیان بەو تاوانانەدا ناوە دوور نکیە ئەمەش بەشێکی تر پێك بهێنێت لەبەڵگەی بەهێزی ناو دۆسیەکە.



# دەرفەتێك بۆ پاكبوونەوەی

## سەرۆك جاشەكان

هێشتا ماوەیەك لەبەردەمدا ماوەتەوە؛ تاوەكو ئەوانەی زانیارییەكی شاراوە یان راستییەك لەهەر رووبەكەوە بێت لەبارەی ئەنجامدانی شالاوەكانی ئەنفال و؛ چۆنێتی كۆكردنەوەو راگواستن و لەناوبردنی ئەنفالكراوەكانەوە دەزانن و درك پێ دەكەن، ئاشكرای بكەن.

گونجاوترین دەرفەتیشە بۆ ئەو جاش و موستەشارانەی بەشدارییان لەقۆناغەكانی شالاوی ئەنفالدا كردوە. وەك شایەتحاڵ و شكایەتكار لەسەر ئەو تاوانانە رووبەڕووی سەدام و دارودەستەكەی ببنەوە لەدادگادا.

ئەم هەنگاوە هەر كەسێك لەوانەی ناومان هێنان بیگرێتەبەر، جگە لەوەی هەڵوێستێكی كوردانە تۆمار دەكات.

بەشێك دەبێت لە رێخۆشكردن بۆ ئەو لێبوردنە ویژدانییەی دەشێ رای گشتی كوردستانی بەگشتی و، كەسوكاری ئەنفالكراوەكان لەكات و ساتی خۆیدا بۆ بەخشین پێیان رەوا ببینن. ئەگینا دوای تەواو بوونی ئەو دۆسیەیە پێدەچێ هیچ دەروازەیەك بۆ خۆ

دەربازکردن و (تانیب ضمیر)ە نەمێنێتەوەو؛ چیتر لەوە بەدوا هێزوو ڕەحم بەهیچ کەس و تاوانبارێك ناکات.

بەپێی خۆ ڕۆیشتن بۆ ناو دادگاو بەشداریکردن وەك کاراکتەرێکی سکاڵا کردوو، زۆر شەرمەزمەندانە ترە وەك کاراکتەرێکی شکات لێکراو ڕاپێچی بەردەم دادوەری لێکۆڵینەوە بکرێتەوە. یان وەك تاوانبارێك هاوشان لەگەڵ سەدام و عەلی کیمیایی لەقەفەسی تاواندا بئاخنرێ.

خۆ ئەگەر هەندێك لەوانە لایان وابێ کەکاتی خۆی لەدوای ڕاپەڕین ئەو لێبوردنەی بەرەی کوردستانی بۆی دەرکردوون بوومتە پەساپۆرتی بەرائەت و پاکبوونەوەیان، ئەوا بەهەڵەدا چوون.

هەمووان ئەو ڕاستییە دەزانین ئەو دۆخەی؛ کەئامادەکاری کرا بۆ ڕاپەڕین و خۆسازدان، دۆخێکی تەواو سیاسی بوو. واتە ئەگەر هەر کەسێك لەوانە بەپێی ئەو بانگەوازەی بەرەی کوردستانییەوە ڕۆیشتبێ، مانای ئەوە نییە پاکبوبێتەوە لەو تاوانانەی بەتایبەتی لەئەنفالدا ئەنجامی داوە.

هەرچەندە زۆرێك لەگەورە جاشە ئەنفالچییەکانیش ڕازی نەبوون بەو لێبوردنەو، لەگەڵ ڕاوە دونانی بەعس و پاشماوەکانیاندا لەبەشێکی کوردستان، ئەوانیش هەڵاتن و بۆی دەرچوون.

بەکوردی و کورتی ئەو لێبوردنەی بەرەی کوردستانی، لێبوردنێکی سیاسی کاتی بوو، بەمەبەستی سەرخستنی بەرنامەی ڕاپەڕین لەکوردستاندا.

کەواتە لەئێستادا بۆ بیرکردنەوە بەئاراستەی بەرژەوەندیی خۆیی‌و دواجاریش بەرژەوەندی گشتی کوردستانییدا، هەر کەسێکیان ئاگا بێتەوەو ئەو هەڵە بقۆزێتەوە؛ ئەوا هەنگاوێکی ئیجابی‌و کاریگەر بەئاراستەی دەوڵەمەندتر کردنی دۆسیەی ئەنفال لەدادگادا دەنێت.

جگەلەوەی بەشێک دەبێت لەپرۆسەی خۆپاککردنەوە لەو تاوانەی کەکاتی خۆی راستەوخۆبێ یا ناڕاستەوخۆ تێی گلاون؛ ئەرکێکی نیشتمانیی‌و نەتەوەییش بەجێدێنێت.



# یەکەم هەڵەی دادوەر

عەبدوڵا عامری علوش، یەکەم دادوەری دۆسیەی ئەنفال بوو کەدەرکەوت.

هەر لەسەرەتای دەستپێکردنی دانیشتنەکانەوە شێوازی ئیدارەدان و بەڕێوەبردنی دادگاییەکەی بەجۆرێك بوو، بەبەراورد لەگەڵ دۆسیەی دوجێلدا، هەر زوو توانی دەسەڵاتی قانونی خۆی بەسەر رەوشی دادگاییەکەدا بسەپێنێت.

ئەو لەیەك کاتدا نەرم بوو وەك حاکم رزگاری دادوەری دۆسیەی دوجێل بەبێ ئەوەی بە(سەید صدام) ناوی صەدامی تۆمەتبار بهێنێ. لەهەمان کاتیشدا توندو دەنگ هەڵبڕو زوو کۆنترۆڵ کاربوو، وەك حاکم رەئوف.

واتە ئیجابیاتی زۆر، دەربڕینی گونجاوو سیفەتی یاسایی پوخت و، باش لەمامەڵەکردن لەگەڵ رەوشەکەدا بەدی دەکرا، ئەم دادوەرە عەرەبە بەسەرەتایەکی دڵخۆشکەر مورافەعەکانی دەکردەوەو دادەخست، بەچەشنێك تێکڕای ناوەندە سیاسی و یاسا ناسان و میدیاکانیش تێبینییەکی وایان لەسەر تواناو پێگەی عامری نەبوو، وەك دادوەر. بەڵام دواجار دەرکەوت ئەم دادوەرەش نەك هەر بەدەر نییە لەکەموکوڕی و تێبینی لەسەر ئەدائی دروست نابێ، بەڵکو

لەحەوتەمین دانیشتنی دادگاییکردنەکەدا رۆژی ۲۰۰۶/۹/۱٤ کەوتە نێو هەڵەیەکی گەورەوە. بەو هیوایەی هەڵەی لەدەم دەرهاتبێ، نەک دڵ و دەروون. ئەویش لەکاتێکدا سەدامی تۆمەتبار باس لەوە دەکات سکاڵاکەران بەدیکتاتۆر ناوزەدی دەکەن. لەپڕا ئەلعامری زۆر بەهێمنییەوە قسەی پێبڕی و وتی (تۆ دیکتاتۆرنیت و نەبوویت، کەسانی دەوروبەرت دیکتاتۆر دروست دەکەن). لەوەختێکدا دەیتوانی هیچ نەڵێ. چونکە سەدام پرسیاری ئاراستەی کەس نەکردو. بەشێوە شەرح ویستی باس لەوە بکات کەئەو رێگەی داوە هاوڵاتی ئاسایی بگاتە کۆشکەکەی و سکاڵا بکات.

دەمودەست و لەدەم دەرهاتنی ئەو رستانە لەلایەن سەرۆکی دادگاوە راستەوخۆ کاریگەری خراپی لەسەر بەرێوەچونی رەوشی ئاسایی دانیشتنەکانی ئەو رۆژە دروست کرد. چونکە دەبوو دوای پشویەک گوێ لەسکاڵای دوانی تر لەشایەتحاڵەکان بگیرێت، بەڵام دانیشتنەکان دواخرا.

دادوەر وەک هاتە قسە دەبوایە بیگوتایە تۆ دیکتاتۆر نیت تائەو کاتەی دادگا ئەم مەسەلانە ساغ دەکاتەوە.

لەو روانگەیەوە بەپێی یاسادا تۆمەتبار بێتاوانە تائەو کاتەی تاوانەکەی بەسەردا ساغ دەبێتەوە.

بۆیە هیچ پێویستی نەدەکرد دادوەر ئەو هەڵە گەورەیە بکات.

(رائد جوحی)یش بەناوی دادگای باڵای تاوانەکانەوە، بەوە پاساوی هێنایەوە کە دواجار دادوەریش (مرۆڤ)ەو وتی تەنیا تورکیز کردنە سەر ئەو خاڵەو لەبیرکردنی ئەو هەمووە ڕێوشوێنو ئیجرائاتانەی دادگا لەئینسافەوە نییە.

کەواتە خودی رائد جوحیش دان دەنێت بەوەدا کەدادوەر هەڵەی فەرمووە.

پرسیاری جدیو گرنگ لێرەدایە، ئاخۆ ئەمە سەرەتایەکە دادوەر تیایدا بێلایەنی خۆی لەدەست بدات؟.

تۆ بڵێی ئەمە یەکەمو دوا هەڵەی سەرسوڕهێنەری ئەو حاکمە بێت؟. ئایا لەم هەڵە فورسەتر نەبێ چیبێ؟ کەبەهیچ کلۆجێ لایەقی دادوەرێك نەبوو خاوەنی دەیان ساڵ ڕۆڵ بینینو دادگاییکردن بێت. ئاخۆ دادوەر هەوڵ دەدات پاساوی قانونی بۆ ئەو هەڵەیە بهێنێتەوە؟.

دانیشتنەکانی داهاتوو وڵامی ئەو پرسیارانەی لێ دەکەوێتەوە. بەڵام هەڵەی گەورەتر لەوەی کەکردی ئەوەیە پاساوی پاسایی بۆ داپۆشینی هەڵەکەی بهێنێتەوە. گەر ئەوەشی کرد بەدڵنیاییەوە بێلایەنی لەدەست دەدات.



# کوردو ڕێگەی

# ماف سەندنەوە، نەك تۆڵە

ئایا کورد بیری لای تۆڵە سەندنەوە بووە، یان بەدوای باشترین چارەسەردا گەڕاوە لەبەرامبەر ئەو هەموو تاوانانەی دەرهەق بەخاكو خەڵكەکەی کراوە، بۆ ئەوەی مافە زەوتکراوەکانی بسێنێتەوە. لەبەرامبەر ئەو تاوانکاریانەشدا ڕێگای دادو عەدالەت بگرێتەبەر.

بێگومان هەمیشە کورد بەتایبەتیش لەدوای ڕاپەڕینەوە (سەرباری تێبینی زۆر) شیاوترین ڕێوشوێنی سیاسىو دیبلۆماسی گرتۆتە بەر، بۆ گەیشتن بەمافو خواستەکانی.

لەئێستاشدا ئەو کەشوهەوایەی ڕەخساوە هەرە زۆرینەی خەڵك داوای دادگایی کردنێکی ڕەواو ڕاستەقینەی تۆمەتبارانی تاوانی ئەنفال بکەن، ئەو دەرهاوێشتەیەیە کەبەو ئارستەکاری لەسەر کراوە.

کەواتە کورد دەیەوێ لەسەر بنەمای سزادانی تاوانبارانو دەستنیشانکردنی ئەوانەی ڕاستەوخۆ بەشداریان کردوە، لەو پەلامارو زنجیرە کارەساتانەی لەماوەی شاڵاوەکانی ئەنفالدا هەر لە (پلانداناندەرو

بڕیاردەرو جێبەجێکەر) لەچوارچێوەی ئەو دۆسیەداو دواجاریش بۆ مێژوو کار بکرێت.

ئەوەش مەعلومە ئەوانەی ئەمڕۆ لەزیندانەدان بەشێکن لەتاوانباران. کەسەرکردایەتی ئەو شاڵاوەیان کردوە. وەك چۆن دەزانرێ زۆرێك لەتاوانباران هێشتا ونن؛ یان لەشانۆکە دوور خراونەتەوە، تاحاڵی حازر لەدەرەوەی بازنەی دادگاکەو لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بەو دۆسیەدان.

ئەمەش پرسیارو رامانی لای چاودێرانی دۆسیەی ئەنفال‌و رای گشتی کوردستان‌و بگرە عێراقیش دروستکردوە.

رام وایە لەماوەی بەڕێوەچوونی دادگاییەکەدا دوور نیە لێیان راپێچی بەردەم عەدالەت بکرێن بۆ لێپرسینەوە.

دوور نیە لێیان وەك شایەتحاڵیش بەرامبەر گەورە تاوانباران بوەستنەوە.

بەدەر لەهەر رتوشێك مەبەستمە ئەوە بڵێم وا پێویست دەکات و بۆ عەدالەتی خۆی؛ دەبێ دادگاو دۆسیەی ئەنفال لەدادگادا، زۆرینەی ناوە زلەکانی تاوانی ئەنفال رووبەڕوو بکاتەوە. لەپای بەشداریکو هاوبەشی کردنیان لەو سەرکێشیانەدا، لەپێناو ئەوەی بەشێوەیەکی دروست ماف بگەڕێندرێتەوە بۆ زوڵم لێکراو.

بۆ ئەوەی تاوانبارە دیارو بەرچاوەکانی هاو زەمان‌و غەیرەش باجی ئەو خوێن رشتن‌و غەدرو خیانەتانەیان بدەنەوە.

کورد چەندین ساڵە خەبات و کۆشش دەکات، بۆ سەلماندنەوەی مافەکانی لەچوارچێوەی یاسادا لەتێکڕای سەردەمەکاندا لەسەردەمی دەستڕۆیشتن و کاتی بەهێزیشدا ئەوە پەیام و پەرچەمی بزوتنەوەکەیشی بووە نەک تۆڵە سەندنەوە و کۆپی کردنی رەفتارە دژ بەمرۆڤایەتییەکانی دوژمنانی کورد.

# مام جەلالو شایەتیدان

دوای ئەوەی لەچاوپێکەوتنێکدا سەرۆک کۆماری عیراقی فیدراڵ، مام جەلال بەشێوازێکی نوێی تەندروست لەمەڕ رەوشی دادگایکردنو مەسەلەکانی پەیوەست بەسەروەریی یاسا، بۆچوونەکانی خستەڕوو.

لەوەڵامی ئەو پرسیارەدا کەپێی وترا وەک شایەتحاڵ بەشداری دەکات لەدانیشتنەکانی دادگادا؟.

ئەو بەجۆرێک هاتە وەڵام سەرنجی دادگاو تەواوی ماف پەروەرانو یاسا ناسانی بۆلای خۆی جوڵاند.

ئەو ساتەی کەوتی: "کاتێک دادگا بانگم بکات ئامادە دەبم".

ئەم دەستەواژەو رستەیە، لەمەغزایدا چەندین خوێندنەوەی نوێ لەژیانی سیاسیو بەتایبەتی پێگەی سەرۆک کۆماری عیراقدا هەڵدەگرێ. چونکە ئەمە یەکەم جارە سەرۆکێک لەماوەی زیاتر لە پەنجا ساڵی رابردووی ئەم وڵاتەدا بەئاراستەیەک قسە بکات، کەدەرخەری ئەوەبێ هیچ بەرپرسو دەسەڵاتدارێک چیتر لەعیراقی دوای بەعس و دیکتاتۆریەتدا لەسەرووی یاساوە نابێتو سەروەریی یاسا دەبێ پارێزراو بێتو هەمووان لەبەردەم یاسادا یەکسان بین.

لەنزیکترین کاردانەوەدا بۆ ئەم دەستەواژەیەی مام جەلال بەکاری هێنا.جەعفەر موسەوی سەرۆکی دەستەی داواکاری گشتی دادگاکە رایگەیاند: مانای ئەوەیە عیراق خێری بەسەردا باریوە.

واتـە یاسـا لەسـەرووی هەمووانەوەیـە. هـەروەها وێـڕای یەكـەم كەسیش كەئەمەی خستە چوارچێوەی دەستەواژە راستەقینەكەیەوە، مام جەلال بوو كەسەرۆك كۆمارە..

بـۆ سـەرۆك كۆمارێـك كەهـەموو تەمـەنی لەخزمـەت ئـازادیو بەدەستهێنانی مافە زەوتكراوەكاندا بەخەرج دابێو، سەختترین رێگای خەباتی لەشاخو، شیاوترین شێوازی سیاسیو دیبلۆماسی بۆ دژایەتی كردنی دیكتاتۆریەت گرتبێتە بەر، دەبێ بەو جۆرە هەڵوێست بنوێنێ.

بەتایبەتیش ئەو سەرۆكەی خۆی كەسێكی مافپەروەرەو لەرێگای سندوقەكانی دەنگدانو هەڵبژاردنی دیموكراسیانەوە گەیشتۆتە ئەو پایەیە. بەدیوێكی تردا ئەگەر مام جەلال وەكو شایەتحاڵیش بەشداری دادگای بكردایە ئاسایی دەبوو، چونكە خۆی كەسێكە رێبەرایەتی بەرەنگاربونەوەی شاڵاوی ئەنفال كردوەو؛ لەنزیكەوە لەگەڵ خەڵكدا ژیاوەو هێرشی كیمیایی كراوەتە سەرو ئەگەر وەك كەسێكی ئاسایی حیساب بكرێت زەرەرمەندیش بوەو ماڵیشی وەك شایەتحاڵەكانی تر رووخێنـراوە. بـەدەر لـەم خوێندنـەوە یاسـاییەو ئامـاژە بـوون بـۆ دەركـەوتن و گـۆڕانی بنـەڕەتی لەدیـدی سـەرۆكی وڵـات لـەقۆناغێكی نوێدا، ئەو وڵاتەی كەلە دروستكردنییەوە دوور بووە لە پیادەكرن و مـەیلی چەسـپاندنی بنـەماكانی دیموكراسـی لـەنێو دامودەزگاكـانیو، پەیڕەوی كردن و رەچاوكردنی مافەكانی مرۆڤ مەسەلەیەكی جێبایەخ نـەبووە. بۆیـە كاتێـك مـام جـەلال بـەو هەڵوێـستەوە بیروبۆچـوونە

راستەقینەکانی خۆی لەو بارەیەوە دەردەبڕێ. بێگومان ئەمیێنە جێ سەرنجی چاودێران و بە خاڵێکی نوێ لەژیانی سیاسی عێراقدا دەژمێردرێت. تەنیا کەسێکیش دەرفەتی ژیان و مانەوەی نەدرابێتی لەعێراقدا لەلایەن دەسەڵاتی بەعسەوە مام جەلال بووە.

دیارە ئەمەش رادەی دیموکرایی ویستی مام جەلال و دژایەتی کردنی بۆ دیکتاتۆرییەت دەگەڕێتەوە. بۆیە رژێمەکەی سەدام حسێن ئەو ئازادیخوازەی بەمەترسی گەورە لەسەر دەسەڵاتەکەی زانیوە. لەهەمانکاتدا توانراو رێبەرایەتیکردنی ئەو گوردە خاکیە بۆ بزوتنەوەکانی گۆڕان و وەرچەرخان لایان شتێکی دیراسەکراوو چاوەڕوانکراو بووە. لەبەر ئەوەش هەر کاتێک ئەو لێبوردنە ساختەیەی ساڵانە لەبۆنەکانی بەعس و موناسەباتەکانی خۆیاندا بۆ (یاخیبوان) دەریان دەکرد. لەدوا دێری (عافوات)ەکانیاندا ئەو دێرە دەنوسرا (ئەم لێبوردنە هەموو کەسێك دەگرێتەوە لەدەرەوەو ناوەوەی وڵات تەنیا جەلال تاڵەبانی نەبێت).

لەپای ئەو رێگە نەدانەو، دواجار رێبەرایەتیکردنی خواستەکانی خەڵکی کوردستان و هەبوونی چەندین بەڵگە بەپێی ئەزموون و رووبەڕوو بونەوەی ئەو رژێمەی تاوانی ئەنفالی ئەنجامدا، ئاساییە مام کەی بیەوێ بچێتە بەردەم دادگا هەم وەك شایەتحاڵێکی ناو رووداوەکانی ئەنفال و هەم وەك شکایەتکارێك لەسەر ئەو ناعەدالەتیەی دەرهەق بەخودی خۆیو گەل و نەتەوەکەی کردوویانە.



# تیمی پسپۆڕو هەڵدانەوەی گۆڕەکان

مایکل سۆنی تریمبل، ئەو پسپۆڕە بوو؛ وەك شایەتحاڵێکی بیانی بەشداری دادگاییەکەی کرد.

لەرۆژی پێنج شەممە ٢٠٠٦/١١/٢٠ و لەبەردەم دادگادا بەوردی باسی ئەو گۆڕە بەکۆمەڵانەی حەزەری موسڵو موسەنای کرد، کەوەکو تیمێکی شارەزا ئیشیان لەسەرکردوەو هەڵیان داوەتەوە.

مایکل سۆنی ئەندازیاری مەدەنیەو لەبواری بەڵگەی جینائی لەکاروباری گۆڕی بەکۆمەڵدا پسپۆڕە.

بەدەربڕینە زانستیەکانی هێندەی تر دۆسەی ئەنفالی لەئاستی جیهانیو میدیایدا بەهێزتر کرد. چونکە وەکو پسپۆڕێکی زانستی بێلایەن، ئیفادەکانی زۆر بەڕوونی خستەڕوو.

هەر لەدەستنیشانکردنی شوێنی گۆڕەکان، هەر لەشێوازی کوشتنی کەسەکانی ناو گۆڕەکان. ئینجا دەست نیشانکردنی جۆری جلوبەرگ، ساڵی کوشتنو تەمەنی قوربانییەکان، هەموو ئەمانە بۆ میدیاکانو رای گشتی دونیا کاریگەری زیاترە، لەهەمان کاتیشدا بۆ خودی دۆسیەکە لەناو دادگادا بەڵگەیەکی مەلموسو باشبوو، لەپاڵ بەڵگەکانی تردا. چونکە دواجار فرەلایەنیو فرە بەشداریی کەسانی غەیری

کوردیش وەکو پاڵپشت و شایەتحاڵ لەسەر دۆسیەکە رەهەندی تر وەردەگرێ و مەودای کاردانەوەکانی زیاتر دەکات.

مایکل سۆنی بەرووونی شیکاریکی خستەڕوو لەسەر چۆنێتی ئیشکردنی خۆیان کەدوو تیم بوون. یەکێکیان تیمی لێکۆڵینەوە لەشوێنەوارو، ئەوی تریان تیمی پزیشکی دادوەریی (طب عدلي).

لەباسکردنی قوربانیەکانی نێو گۆڕەکەدا ئاماژەی بەگۆڕێکدا کەلەناوچەی موسڵ بووە.

ئەم گۆڕە( ١٢٣) قوربانی تێدا بووە. کە( ٢٥) یان ژن بووەو (٩٨) یان منال بووە.

ئەمەش ئەو ڕاستیە دوپات دەکاتەوە کەژنە شایەتحاڵەکانی دانیشتنەکانی پێشووتر دەیانوت ئێمەیان لەپیاوەکان جیاکردۆتەوە.

ئەو لێکۆڵینەوەو توێکاریانەی لەسەر جەستەو کەلوپەل و گۆڕەکان لەلایەن پسپۆڕ تریمبلەوە کرابوون، بەو شێوازەی لەشاشەی سینەما سکرینی هۆڵەکەوە پیشانی دەدا. هەر لەژمارەی چاو بەستراوەکان. ژمارەی دەست بەستراو، رێژەی گوللە بەرکەوتوو بەپێی ژمارەی گوللە. هەموو ئەو ئامارو داتایانە کەبەزمانی ژمارە روونی دەکردنەوە کاریگەرییان لەچەندین شایەتحاڵی کوردی ناو رووداوەکان زیاتر بوو..

سەدام حسێن لەبەرگریکردن لەخۆی و هاوەڵەکانی وەك جارەکانی تر دەیویست لەو حەقیقەتە حاشا هەڵنەگرانە ڕا بکات. بەڵام

نەیدەتوانی. لەبەر ئەوەش نەیتوانی نکۆڵی بکات لە بوونی گۆڕی بەکۆمەڵو دروستکردنی سەدان گۆڕی وەنی بەکۆمەڵ لە سایەی دەسەڵاتی رژێمەکەی ئەودا، بۆیە تەنیا ئەوەی وت: کە (نازانم چ پەیوەندییەک هەیە لەنێوان گۆڕی بەکۆمەڵو دۆسیەی ئەنفالدا)..

لەکۆتاییدا لێکۆڵەر بەتەواوی بۆ دادگای روونکردەوە کە قوربانییەکان لەگوندنشینەکانی کوردستانن‌و گواستراونەتەوە بۆ ناوچەکانی بیابان.

ئەوەیشی روونکردەوە ئەو جلوبەرگانەی لەبەر قوربانییەکاندا بووە هەمووی جلوبەرگی کوردی بوون.



## صابر ئەلدوریو

## عتیادی خاص

یەکێك لەو تۆمەتبارانەی لەسەرەتای دانیشتنەکانی دادگادا دەیویست خۆی بەکەسێکی بێ ئاگا لەئامادەکاریەکان بۆ شالاوەکانی ئەنفال و وردەکاریە سەربازییەکان پیشان بدات. صابر ئەلدوری مدیری بەڕێوەبەرایەتی ئیستخباراتی سەربازی گشتی بوو.

هەر جارێك باس بهاتایەتە سەر بەشداری ئیستخبارات و بەتایبەتی ئیستخباراتی عەسکەری لەوردەکاریەکاندا، ئەمو هەڵیدەدایەو دەیوت:

ئیشی ئێمە تەنیا کۆکردنەوەی زانیاری بووە لەسەر ناوچەکەو؛ بوونی چەکداری ئێرانی لەشوێنەکان. لەدەرەوەی ئەوە هەرچی روویدابێ لەئەنفالدا ئیستخباراتی عەسکەری بەشدار نەبووەو ئاگای لەو ڕێوشوێنانە نییە. بەڵام لەچەند دانیشتنێکی دواتردا کەمتەرخانکرا بۆ خستنەڕووی بەڵگەنامەکان.

دەرکەوت ڕۆڵی ئەلدوری ئەگەر زیاتر نەبوو بێ لەتاوانبارانی تر؛ ئەوا هیچی کەمتر نەبووە.

وەکو لەبەڵگەنامەکاندا دەردەکەوێت. چونکە بەشێوەیەکی زۆر زانستیانە لەبارەی چۆنێتی بەکار هێنانی چەکی کیمیایی و هەڵبژاردنی جۆری کیمیاییەکەو سروشتی بەکار هێنانەکەی لەشاخ یان لەدەشت لەشوێنی دارستان، لەناوچەی بەفراوییدا..

بۆ بەکار هێنانی دەستەواژەی (عیتادی خاص) لەئەدەبیاتی سەربازی و ئەمنی و ئیستخباراتی رژێمی بەعسدا بەمانای گازی کیمیایی هاتووە؛ لەدەست نیشانکردنندا جۆرو ناوەکانیان دواوە. خودی ئەلدوری جەختی لەپێویستی بەکارهێنانی ئەو چەکانە کردۆتەوە بەچڕوپڕی لەشاڵاوەکانی ئەنفالدا.

لەبەڵگەنامەیەکدا کەلەسیو دووهەمین دانیشتنی دادگادا خرایەڕوو؛ بەڕێوەبەرایەتی ئیستخباراتی سەربازی گشتی، نوسراوێکی نهێنی و شەخصی و بەپەلە بەئیمزای ئەلدوری بەرزکردۆتەوە بۆ سکرتێری سەرۆکایەتی کۆمار بەناونیشانی (استخدام عتاد الخاص)، لەو نوسراوەدا ئەلدوری داوا دەکات لەناوچە بەفراویەکاندا چەکی کیمیایی لەجۆری زارین بەکار نەهێنرێ، چونکە بەفرەکە دەبێتە هۆی نەهێشتنی کاریگەری کیمیاییەکەو؛ مادە کوشندەو ژەهراییەکەی ناهێڵێ.

هەر لەو نوسراوەدا پێشنیار دەکات، غازی خەردەل بەکار بهێنرێ. لەبەر ئەوەی بڕێکی باشیان لەبەردەستدایەو سروشتی

گازەکــە بەجۆرێکــە کاریگــەری زۆرتــری دەبێــت، چـونکە زیــاتر دەمێنێتەوە؛ ئەگەر لەناوچە بەفراوییەکانیشدا بەکار بهێنرێ.

دوای ئەوەی دادگا چەندین بەڵگەنامەی زیندوو، بەموۆرو ئیمزای تــەری صـابر ئەلدوریــەوە خــستەڕوو، نــاوبراو نــەیتوانی وەك پێشتر لەزۆرینەی بەڵگەنامەکان نکۆڵی بکات، هەر چەندە بۆ ماوەی زیـاتر لــەدوو ســەعات گفتوگــۆکردن، هــەوڵی دەدا خــۆی لەئەنجامــدانی شـاڵاوەکان بــەدوور بگــرێ. بــەڵام نــەیتوانی لەبەرامبــەر زینــدوێتی بەڵگەنامەکان‌و، هێزی پرسیارو، تێبینی دادوەرو، داواکاری گشتیدا خۆی دەرباز بکات.

ئەلــدوری لەکۆتاییــدا وتــی: ئــەو ئیمزایانــەی بەســەر بەڵگەنامەکانــەوەن بــەهۆی مــن کــردوومن‌و ئــەرکێکی ســەربازی بــووە لەسەرم‌و ئەنجامم داون.



## سوڵتان هاشم:

# بەخشینی "نوط الشجاعة" بەنهێنی

بەپێی ئەو بەڵگەنامانەی لەدادگادا دەخرێنە روو، هەروەها بەگەڕانەوە بۆ رووپەڕی رۆژنامەو راگەیاندنەکانی رژێمی بەعس لەساڵی هەشتاو هەشتدا، دەردەکەوێت فیلەقی یەک کەسوڵتان هاشم فەرماندەی بووە، سەرەکیترین رۆڵی لەعەمەلیاتی ئەنفالدا هەبووە.

هەر بەگرتن و راگواستن و سوتاندن و کیمیابارانکردنەوە.

خودی سوڵتان هاشم لەدوای عەلی کیمیایی زۆرترین فەرمانەکانی مجلسی قیادەی سەورەو سەرۆکایەتی ئەرکانی جەیش بەشێوەیەک کەبەدڵی ئەوان بێت جێبەجێ کردوە.

بۆیە نەک بەر لەتەواو بوونی قۆناغەکانی شالاوی ئەنفال، بەڵکو لەناوەڕاستی قۆناغەکاندا؛ واتە لەئەنفالی سێوە بڕیاری پێدانی (نوط الشجاعة) ی بۆ دەدرێ. بەلام پرسیاری گرنگ لێرەدا ئەوەیە بۆچی بەشێوەیەکی نهێنی خەلات دەکرێت؟

وەکو لەو نوسراوەدا دەردەکەوێت کەلەمەکتەبی ئەمانەتی نهێنی هێزە چەکدارەکانەوە بۆ دیوانی سەرۆکایەتی نێردراوە لە ١٩٨٨/٤/٥ کەتیایدا فەرمانی پێدانی (نوط الشجاعة) دەدرێتە سوڵتان هاشم وەک

خەڵاتە لەپای ئەنجامدانی ئەرکەکانی لەشاڵاوەکانی ئەنفالدا بووە؛ بەو پەڕی سەرکەوتووییەوە.

ئەم بەڵگەنامەیە لەسێو سێیەمین دانیشتنی دادگادا خرایە روو.

هەر لەودانیشتنەدا سوڵتان هاشم نکۆڵی لەراستێو دروستی ئەم بەڵگەنامەیە نەکرد، لەو بارەیەوە وتی: من شانازی دەکەم خەڵات کراوم، راستیشە بەو شێوەیە تەکریم کراوم..

لەسەرەتادا دەبینین بەنەهێنێو دوور لەچاوی کامێراو راگەیاندنەکان خەڵاتی بەشداربووانی شاڵاوەکانی ئەنفال کراوە، بەڵام دواترو پاش کۆتایی هاتنی قۆناغەکانی ئەنفال بەهۆی بێدەنگی دونیاو رێکخراوەکانی مرۆڤدۆستو دەوڵەتان؛ بەڵێشاو دەرەجەدارانی سوپاو سەربازو موستەشارو سەرۆك جاشەکان لەدیوانی سەرۆکایەتی کۆمار ریزدەگران و؛ بەدەستی سەدام حسین خۆی خەڵاتی (شەرف) دەکران.

شایەنی باسە سوڵتان هاشم سەرکردایەتی ئەنفالی یەكو ئەنفالی سێو ئەنفالی چوارو ئەنفالی هەشتی کردووەو راستەوخۆ بەشداری شاڵاوەکانی کردوە.



## بایکۆتی پارێزەرانی داکۆکیکار

پاش ئەوەی بەبڕیاری حکومەتی عیراقی؛ داوەر عەبدوللا عامری لەبەڕێوەبردنی دانیشتنەکانی دادگایەکە لابرا.

پـارێزەرانی داکۆکیکـار لـەتاوانباران بـەبیانووی دەسـتوەردانی حکومـەتی عیراقـی لەڕێوشـێنەکانی بەڕێوەچـوونی دادگایەکـە. بەهەموویانـەوە بڕیاریانـدا هـۆڵی دادگـا بـەجێ بهـێڵن و بـایکۆتی دانیشتنەکانی داهاتوو بکەن.

هەرچـەندە لەواقیعـدا ئـەوەی لـەڕێی شـەفافیی و راسـتەوخۆیی بینینی دانیشتنەکانەوە دەبینرێت لەشاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە، هیچ فـشارو دەسـتێوەردان و ڕێگرییـەك لەقـسەکردن و بەشـداریکردنی تۆمەتباران و پارێزەرەکانیان لەماف و حەقی خۆیان بەدی ناکرێت. ئەمە جگەلەوەی تۆمەتباران و پارێزەرەکانیان سوودێکی زۆریان لەو کەشە دیموکراسیە وەرگرتووە؛ کەلەعیراق و دادگاکەشدا هەیە.

سەرباری ئەمانەش دەربڕین و موداخلەکردنی خودی پارێزەرانی داکۆکیکار بەشێکی زۆریان دوورن لەبەجێ هێنانی پیشەو ئیشی پارێزەریکو، لەچوارچێوەی بەهەنند وەرنەگرتن بۆ هەیبەتی دادگایەکە رەفتار دەکەن. وەکو ناوهێنانی سەدام حسێن بە(سەید الرئیس)و سوکایەتیکردن بەقوربانیان و دەرچوون لەو بابەتانەی پەیوەندی بە سکاڵای شایەتحاڵەکانەوە هەیە؛ ئەمە جگەلە هەوڵدان بۆ دورخستنەوەی رەوتی بابەتی دادگایەکە بەئاقارێکی تردا، لەرێگەی پرسیاری ناجۆرەوە.

هەرچەندە دادوەر چەند جارێك لەو هەڵسوکەوتە ئاگاداریکردنەوە؛ کەدەبێ وەکو یاساناس و پارێزەر مامەڵە بکەن و، هەوڵ بدەن پرسیارو تێبینیەکانیان لەچوارچێوەیەکی یاساییدا پێشکەش بکەن. بەڵام ئەوان گوێیان بەم لایەنە نەدەدا، بەڵکو وەکو پەروەردەکراوێکی قوتابخانەی بەعسیزم دوور لەپیشەی یاساپارێزیی بەجۆرێك دەیانویست واقیعەکە بشێوێنن کەقوربانیەکانی ئەنفال تاوانبار بوونەو، ئەنجامدەرانی ئەنفالیش بێتاوان.

لەئاکامیشدا لەبەر ئەوەی نەیانتوانی لەبەرامبەر دادپەروەری دادوەر لەرووی یاسایی و پاراستنی سەربەخۆیی پێگەکەیەوە لەبەڕێوەبردنی دانیشتنەکاندا، هەروەها بەجێهێنانی ئەرکە یاساییەکان لەلایەن دەستەی داواکاریی گشتییەوە رووبەڕوو ببنەوە. ناچاربوون هۆڵی دادگا بەجێ بهێڵن. بەمەبەستی دروست کردنی

فشار، بەڵام ئاکام دادوەر ئەوەی ڕاگەیاند کەئەگەر ئەوا هەوڵ پارێزەران سووربوون لەسەر بایکۆتکردن، ئەوا خودی دادگا لەتوانایدایە پارێزەری داکۆکیکار بۆ تۆمەتباران پەیدا بکاتو لەناو هۆڵی دادگادا ئامادەیان بکات. تا بەرگری بکەن لەموەکیلەکانیان.



## مانگی ڕەمەزان و کیمیاباران

"دەمەویت لەسەدام و عەلی کیمیاوی بپرسم بۆچی لەمانگی ڕەمەزاندا کیمیابارانیان کردین و دایک و باوکمیان بەزمانی ڕۆژووەوە گیانیان لەدەستدا"

ئەمە وتەی یەکێک لەشایەتحاڵەکان بوو، کەلەبیستەمین دانیشتنی دادگاداو لەکاتی گێڕانەوەی ئەو دەردە سەریانەی بەسەریدا هاتووە لەناو هۆڵی دادگادا باسی لێوە دەکرد.

شایەتحاڵەکە خەڵکی گوندی(وەرێ)ی ناوچەی بالیسان بوو، بەزمانێکی سادەو کوردیەکی ڕەوانەوە؛ ئەو بەسەرهاتە دوورو درێژو پڕ مەترسیانەی بەوردی گێڕایەوە. کەچۆن لە ڕۆژی ١٩٨٨\٥\١٨ چوار فڕۆکەی ڕژێم هاتوونەتە سەر گوندەکەیان و کیمیابارانیان کردووە.

سەدام حسێن بەبێ ئەوەی هیچ وڵامێك یان قسەیەکی بۆ ئەو پرسیارەی شایەتحاڵ هەبێ، بەو پەڕی خوێن ساردیەوە خۆی و عەلی کیمیاویش نقەیان لەخۆیان بڕیبوو.

لەو دەربڕینانەی شایەتحاڵەکە؛ کەتەزووی بەگیانی هەموو کەسێکی خاوەن هەست و کەسایەتی و مرۆڤایەتیدا دەهێنا، جگە

لەوەش بەگەڕانەوە بۆ ئەو سەردەمەو هەڵوێستی دونیا بۆ تەواوی ئومەتی ئیسلامیو ڕێکخراوە ئیسلامیەکانو دەوڵەتانی پەیماناو ئیسلامیو عەرەبی شورەییەکی گەورە بەدی دەکرێت. لەهەمانکاتدا هەڵدانەوەی ئەو فایلانەو دەرخستنی ئەو ڕاستیانە جگە لەچەسپاندنی تاوانەکانی ڕژێمی بەعس لەدادگای باڵای تاوانەکاندا؛ لەڕووی سیاسیو ویژدانیشەوە ڕاستەوخۆیێ یان ناڕاستەوخۆ، کاریگەری لەسەر لایەنی تریش دادەنێت.

گەر وردتر ڕابمێنین؛ دەبینین لەو ڕۆژگارەدا لەژێر ناوی لەشکری قەعقاعو خالدو بەپەرچەمی (ئەنفال) ەوە لەمانگی خێرو ناشتیدا کوردی بەرۆژوو بوو، گوندنشینی خاوەن مزگەوت و خانەقاو زمان بەرۆژوو، کیمیاباران دەکرێت لەناو ماڵوحاڵو گوندی دووره دەستی خۆیدا.

ئەبێ تاوانی ئەو خەڵکە چی بێت؟ هەروەکو دواتر پارێزەری دەستەی بەرگریکار لەمافی کەسێتی ئەنفالکراوەکان پرسیاریان لەشکایەتکار کرد.

بۆچی کیمیاباران کراون؟ ئەویش دەمودەست هاتنە وەڵامو وتی: تەنیا لەبەر ئەوەی کورد بووین!.

پێیان دەوتین ئێوە جەلالین..

موخەڕیبن



## پێیان دەوتین ئێوە جەلالین.. موخەڕیبن

لەئەنفالدا؛ هیچ پاساوو تۆمەتو بیانویەك نەبوو. ژنو منالو پیرو خەلکی بێدیفاع بەو جۆرەی بەسەریاندا هات مامەلەیان لەگەلدا بکرێت.

لەچەرخی تازەدا ئەوەی جەلادەکان بەئەنفالکراوەکانیان کردوە بەپێوانەی گشت یاسا ئاسمانیو زەمینیەکان؛ نەك هەر جێی نابێتەوە بەلکو قبولی ناکاتو ریسوای دەکات. چونکە ناجۆریو نامرۆڤانەیی رەفتاری جەلادەکان دەرهەق بەژنو پیرو جوانی ناوگرتوخانەکان بەجۆرێك بووە مەگەر هەر خودی ئەنفالکراوەکان بتوانن بیگێڕنەوەو گوزارشت لەو ژانو ئازارو زولمە بکەن.

فەوزیە مەحمود ئەشرەف یەکێك بوو لەشایەتحالەکانو لەکۆمەلگای زێرینۆکی پارێزگای سلێمانیەوە هاتبوو، لەدایکبووی سالی هەزارو نۆسەدو پەنجا بوو.

بەخەمێکی قولەوە باسی لە ئەتککردنی پاکیزەکان دەکرد بەدەستی ئەفسەرو بەشێك لەپاسەوانەکانی نوگرە سەلمان.

فەوزیە وتی: شەوی وا هەبوە ئەو زالمانە پێنج تاشەش کچیان لەقاعەکان دەبردە دەرەوەو بەزۆر دەیانبردن بۆلای خۆیان.

هەروەها بەسەرهاتی سك دڕینی سەرکەوتی کوڕی بۆ دادوەر گێڕایەوە، کەلە نوگرەسەلمان لەگەڵیدا بووە.

سەرکەوت ئەو وەختە تەمەنی هەشت نۆ ساڵان بووە، کاتێك بۆ پەیداکرنی تەنەکەیەك ئاو فەوزیە خۆی دەگەیەنێتە مەحتورەی ناوی سەربازەکانی گرتوخانەکەو سەرکەوتیشی لەگەڵدا دەبێت.

یەکێك لەسەربازەکان بەقیڕەو هاوار پەلاماریان دەدات‌و بەتفەنگەکەی دەستی کەحەربەی پێوە بووە کاتێ رایدەوەشێنێ سەرکەوت بەردەکەوێت‌و سکی دەدڕێ.

ئەم رووداوە بەبەرچاوی ئەفسەرو دەرەجە دارەکانەوە سەربازەکە ئەنجامی دەدات بەبێ ئەوەی هیچی لەگەڵدا بکەن‌و! پێی بڵێن بۆوات کرد.

دوای تەواو بوونی گێڕانەوەکەی دادوەر لەپرسیارێکیدا بەفەوزیەی شکایەتکاری وت: ئەو ئەفسەرو سەربازانەی لەوێ بوون ئەیان دەوت لەبەرچی ئێوەیان هێناوە بۆ ئەو شوێنەو بەو شێوازە رەفتارتان لەگەڵ دەکەن؟.

فەوزیە هاتە وەڵام‌و بەدادوەری وت: ئەوەڵڵا پێیان نەدەوتین، بەڵام چەند جارێك کەتوڕە دەبوون پێیان دەوتین ئێوە جەلالین.. ئێوە موخەرییبن.



## بەگومانم لەبوونی نوگرە سەلمان

صابر ئەلدوری سەرۆکی ئیستخباراتی رژێمی بەعس لەیەکێك لەدانیشتنەکانی دادگای ئەنفالدا ئەم قسەیەی کرد.

کچە کوردێکی شایەتحاڵ باسی لەخراپی گوزەرانی خۆیانو ئەو بارودۆخەی تێی کەوتبوون لەگرتووخانەی نوگرە سەلمان دەکرد، ئەو پەتاو نەخۆشیو مردنەی بەسەر گیراوەکان دەهاتو، ئەو تەعداو زوڵمەی لەدەستدرێژی لەسەر کچانو ژنان دەکرا بەوردی دەگێڕایەوە.

شایەتحاڵەکە بەسادەیی خۆیەوە؛ وێنەی رووداوەکانی دەدایە بەرگوێی ئامادەبوانی ناو هۆڵی دادگاکە.

کچەکە وتی: ژیانمان وەك جەهەنەم وابوو، هەر رۆژەو مردنی هێواشی چەندین ئازیزی خۆمانمان بەبەرچاوی خۆمانەوە دەدی .

لەوەش خراپترو ناخۆشتر لەدەرەوەی قاعەکان لاشەی مردوەکان دەخرانە زێر لم، ئینجا سەگەرەشو سەگەلی تر لاشەکانیان دەردەهێناو دەیان خواردو؛ دەیان شێواندن.

دوای ئـــەوەی شـــایەتحاڵ لەقـــسەکانی بـــووەوە دادوەر محەمـــەد ئـــەلعرێبی رووی کـــردە تۆمـــەتباران و پێـــی راگەیانـــدن پرســیارو تێبینیەکانی خۆیان رووبەروو شایەتحاڵ و شکایەتکار بکەنەوە.

لەنێو قسەی تۆمەتباراندا ئەوەی پەیوەندی بەخودی ناوو بوونی نوگرەسەلمانەوە هەبوو وەکو گرتووخانە. لەیەکێك لەدەربڕینەکانیدا صابر ئەلدوری وتی:

لەراســتیدا مــن گومــانم هەیــە کەبینایــەك یــان ســەربازگەو گرتوخانەیەك هەبێت بەناوی نوگرە سەلمانەوە!. لەبەر ئـەوەش بـاوەڕ بەو قسانە ناکەم کەدەوترێت.

هـەر لـەو ساتەوەختەدا یـەکێك لەئەنـدامانی دەسـتەی داواکـاری گشتی داوای لەدادگا کـرد بەپێکهێنانی لیژنەیەك بـۆ بەدواداچوون و سـاغکردنەوەی بـوون و نـەبوونی بینـای نـوگرە سـەلمان. دادوەریـش دەستبەجێ بڕیاریدا بەپێکهێنانی لیژنەکەو داوای کرد بڕیارەکە تۆمار بکرێت.

ئـەوەی پێویـستی بـە تێڕامـان هەیـە ئـەو شـێوازی مامەڵـەکردن و کۆڵەواریــــە بــــوو کەتۆمــــەتباران بەشــــپرزەییەوە لــــەماوەی موداخەلەکردنیانـدا دەیـان نوانـد. ئـەگینا خـودی صـابر ئەلـدوری و تۆمەتبارانی تر؛ لەئامادەبووانی هۆڵی دادگاکە باشتر دەیـانزانی ئـەو گرتووخانەیــە هــەبووە لەکوێیــەو بــەچ شــێوازێك هــەزاران کــوردی ئەنفالکراویشی تیادا کوژراو ئەتکراو کرانە ژێر لەوەی ئەگەڕانەوە.

تۆمەتباران بۆ لەخشتەبردن و شێواندنی ڕاستییەکان چەندین تەڵەکەبازییان بەکاردەهێنا بۆ خۆ دەربازکردن لەو شەرمەزارییەی لەچوارچێوەی ئەو قەفەسو ڕووبەڕووبوو نەومیەی کێژانی زوڵم لێکراودا تێی کەوتبوون. بەڵام ئازادی و حوکمی قانون تانەوپەڕی پێدانی ماف مامەڵەی لەگەڵ هەمووانیدا دەکرد. تاوەکو بگەنە دوا بڕیارو بیانوو بڕین.

لەبەر ئەوە جگە لەو هەموو شایەتحاڵەی باسیان لەنوگرە سەلان و دەردەسەرییە بەسەر هێنراوەکانیان دەکرد. کەلە دەیان کەس زیاتر بوون.

هێشتا بۆ باشتر دەرخستنی ڕووی ڕاستییەکان داوەرو دەستەی داواکاری گشتی زۆر ژیرانە لەگەڵ ئەو ڕەوشەدا هەوڵیان دەدا بڕۆن. تا دەگەنە دوا ئەنجام.

ئەگینا شایەتیدانی چەند شکایەتکارێك لەسەر بوون و ژان و زامەکانی ناو نوگرەسەلمان بۆ خۆی نەك هەر حاشا هەڵنەگر بوو. بەڵکو پیشاندان و دەرخستنی ڕووی نامرۆڤانەی صابر ئەلدوری و هاو قەفەسیەکانی دەگەیاندە ئەوجی حەقیقەت.



## هێز لەسادەییدا

ئەو شایەتحاڵانەی لەساتەوەختەکانی سکاڵاکردندا، ئەو پەڕی سادەییو خاکێتی خۆیان پیشاندا. لەئەوجی هێزو بڕوا بەخۆوە بوون و دەرخەری حەقیقەتی گێڕانەوەی راستی رووداوەکان بوون بۆ دادگا.

ئەوەی ئەوان گێڕاپانەوە مەگەر هەر خۆیان بتوانن بەوجۆرەو بۆ یەکەم جار لەبەردەم درندەترین جەللادی سەدەی نوێو لەناو هۆڵی دادگاو؛ بەبەرچاوی رای گشتی دونیاو میدیاکانەوە بیدرکێنن و، گوزارشت لەناخ و بەسەرهات و دەردە سەریەکانیان بکەن.

بۆ پیاوو ژنێك کەگشت تەمەنی لەگوندی دوورە دەست و کوێرە دێدا بەبێ خوێندن و خوێندەواریی بەسەربردبێو، کەمترین ئاگایی لەدادگاو مەسەلە یاساییەکان هەبووبێو، بتوانێ بەوجۆرە ئیفادەکانی پێشکەش بکات.. لەهەناوی ئەو هونەری دەربڕینەدا هێزێکی گەورە بەدی دەکرێت.

زۆربەی جارەکانیش بینەرو دەستەی دادگاکەش سەرسام بکات، ئەوا هونەرێکی بەرزە.. هەروەها ئەگەر بەشێك لەگێڕانەوەکانیشی

نەبێتە مەحزەرو نەنوسرێو. باس لەمردنی منداڵ و گوێرەوغانی گوندەکەی و هەبوونی لاشەی گوندنشینەکانی بەتەنیشتیەوەکانی بۆخۆی دەرخەری گەورەیی تاوانەکەو ئەو واقیعە رەش و تاڵەی ناو رۆژگاری ئەنفالە.

ئەو دەربڕینانە پەیوەندی بەسۆزو کەوتنە ژێرباری عاتیفەوە نیە، وەکو هەندێك لەرۆژنامەکاندا کەوتونەتە هەڵەی رەخنەگرتن لەچەند شایەتحاڵێك.

راستە کورت دەبڕین و ئەوەی گرنگە بۆ دۆسیەو دادگاکە بوترێ باشترەو؛ پێشتریش واچاکترە شایەتحاڵ چەند جارێك رابهێنرێ.

بەلام لەدواجاردا ئەوەی شایەتحاڵەکان لەگوزارشتکردن لەمەینەتیەکانی خۆیان و ئەوەی بەسەریاندا هاتووە، زیانی بۆ دۆسیەکەو ئیفادەکانیان نابێ بەڵکو لەڕووی سۆزەوە کاریگەری دادەنێ لەسەر ئەوانی تری دەرەوەی دادگا.

ئەمەش بۆخۆی جێیەك دەگرێ. کەوابوو ئەوەی چاودێرانی دادگایەکەو ئێمەمانان رەوشی بەڕێوەچوونی دانیشتنەکان موتابەعە دەکەین، کەمترین خۆهەڵکێشان و خۆنواندن و زیادەڕۆیی لەلایەن شایەتحاڵە سادەو هەڵقوڵاوەکانی ناو ژان و ئازارەکانی ئەنفالەوە نابینین.

دیارە شڵەژان و کەموکوڕیش لەدەربڕین و شێوازی بەیەکەوە بەستنی رووداوەکان لای یەك دوو شایەتحاڵێك بەدیدەکرێ.

بەڵام ئەمە ناکاتە ئەوەی بووترێ شایەتحاڵەکان لەئاستی پێویستدا نین و نەبوون. بەڵکو لە دەرئەنجامدا دەتوانین بڵێین هێزی شایەتحاڵەکان بەسادەیی خۆیانەوە ئەگەر زیاتر نەبێ لەبەڵگەی نوسراوو دۆکیۆمێنت و شریتە دەنگییەکانی خودی تاوانباران ئەوا هیچیان لەبەهێزکردنی دۆسیەکە کەمتر نییە.



# سەدام و شەرەف

لەو لائیحەیەی بەڕێز داواکاری گشتی مونقز ئالفرعەون لەیەکەم دانیشتنی دادگادا خستیە ڕوو؛ سەبارەت بەناساندنی کارەساتەکانی ئەنفال و ئەو تاوانانەی لەو چوار چێوەیەدا ڕوویداوە. سەرەتایەك بوو، تیایدا هەموو تاوانبارانی بەتەواوی هێنایە شۆك و شڵەژان. چونکە بەوردی ئاماژەیدا بەهەریەکە لەتاوانەکانی دژی مرۆڤایەتی و تاوانی شەڕو تاوانی قڕکردنی ڕەگەزی؛ کەجینۆسایدیان پێ دەسەلمێنرێ و. بەپێی یاسای نێودەوڵەتان لەگەورەترین تاوانەکان دەژمێردرێن، سەدام حسین لەبەرامبەر ئەو تاوانانەدا خۆی کڕکرد، تەنیا لەسەر یەك تاوان هاتە وەڵام، ئەویش دەستدرێژی سێکسی بوو بۆ سەر کچان و ژنانی ئەنفالکراو، حاشای کرد کەتاوانی لەو جۆرە لەسایەی دەسەڵاتی ئەودا ڕووی دابێ.. بێدەنگی ئەو لەبەرامبەر ئەنفالکردن و گوندو ڕەزو باخ سوتاندن و، لەگەڵ ئەوەشدا زیندە بەچاڵکردنی منداڵ و ژن و گەورەو بچوکی کورد، لەڕووکەش و ناخیشدا بەمەسەلەیەکی ئاسایی دانا.. بەڵام تەنیا لەمزاهیردا (اغتصابی) پێ

هەزم نەکرا. چونکە راستەوخۆ لەرێگەی تەلەفزیۆنەوە پەخش دەکرا.
کاتێکیش لەیانزەهەمین و دوانزەهەمین دانیشتنی پێش نیوەڕۆو دوای
نیوەڕۆی دادگادا، دوان لەشکایەتکارو شایەتحاڵەکان باسیان لەشێوازی
مامەڵەکردنی ئەفسەرو پیاوانی رژێمەکەی بەعس دەکرد لەگەڵیان
لەگرتوخانەکانی دوبزو تۆپزاوەو نوگرەسەلمان کەچۆن و بەچ
شێوازێکی نامرۆڤانە ویستویانە پاکیێزەییان لەکەدار بکەن،
بەبەرچاوی سەربازو گیراوەکانی ترەوە بردنیان لەناوەختە شەودا بۆ
ژوورە تاریک و ناشرینەکانیان و بەمەبەستی دەستدرێژی کردنە
سەریان، شایەتحاڵی یەکەم کاتێک باسی لەو سوکایەتیانە دەکرد کەپێی
کراوە دوای لەدەستدانی خوشک و براو مردنی دایکی بەبەرچاوی
خۆیەوە دابڕینی باوکی لێیان بەبەردەوامی تەعدای لێدەکراو هەموو
ساتێ لەپای ئەو نالەباریانە خۆزگەی مەرگی دەخواست.

لەدەرئەنجامی ئەو مامەڵە نامرۆڤانەی بەعسیەکان، سەدام
حسێن و عەلی کیمیاوی و هاوەڵەکانی نەک هەر نقەیان لێوە نەدەهات و
هیچ پاساوو قسەو وەڵامێکیان بۆ ئەو گێڕانەوەی راستیانە نەبوو،
کەشایەتحاڵەکان بێ پەردە قسەیان لەبارەوە دەکرد؛ بەڵکو خودی
سەدام لەو ساتەوەختەدا ئەو قورئانەی کەبەدەستیەوە بوو، کەتەنیا
بۆ ساختەکاری و بەردەوامیدان بەهەڵخەڵەتاندنی رای گشتی، لەگەڵ
خۆیدا هێنا بویە هۆڵەکەوە، دەقی قورئانەکەی کردەوە، بۆ ماوەی
زیاتر لەچارەکە سەعاتێک چاوی لەسەر لاپەڕەیەکی قورئانەکە بوو،

دیار بوو کەهەر بۆ خۆخڵەفاندن و خۆ دزینەوە بوو لەو باسەو ویژدان هەژێنانەی ئەو کیژۆڵە کوردەی؛ کەبەوپەری سادەیی خۆیەوەو بەکاریگەریەکی دەروونی ناخ سوتاندنەوە ئەو تاوانانەی دەرهەقی کراوە دەگێڕایەوە. خۆ کەڕکردن لەئاست ئەو حەقیقەتە تاڵانە، ئەو هاتنە گۆیەی دانیشتنی یەکەمیشی دەم بەست کرد. کاتێك داواکاری گشتی لەناو لائیحەکەیدا باسی لەئەتککردنی کیژۆڵەی کورد کرد بەدەستی بەعسیەکان. هەر لەهەمان دانیشتندا دوای ئەوەی دادوەر داوای کرد شکایەتکارێکی تر بێتە هۆڵەکەوەو ئیفادەی خۆی بدات. شۆڕە ژنێکی تر بەجل و بەرگی کوردیەوە رووی کردە دادوەرو، دەستی کردە گێڕانەوەی ئەو زوڵم و تاوانانەی دەرهەق بەخێزان و هاوزمان و هاوگوندیەکانی کراوە. پاشان باسی لەگواستنەوەیان بۆ قەڵای قۆرەتوو، پاشتر بۆ دوبزو؛ ئینجا نوگرەسەلمان کرد. لەباسکردنی ئەو دەستدرێژیانەی کراوەتە سەری هەمدیس صدام، لەگەڵ ئەوەی ژنە کورد کەوتە باسی ئەو بێ ئابڕوییەی دارودەستەکەی صدام دەرهەقیانی کردوە. ئەمیش یەکسەر لەسەر کورسیەکەی خۆی لەناو قەفەسەکەوە بەدانیشتنەوە بەلای دەستەچەپیدا وەرگەڕاو دەستی کردە نوێژکردن بەو جۆرە خۆی خەریك کردو زیاتر لەهەشت دەقیقەی پێ چوو، گوایە نوێژ دەکات. بەبێ ئەوەی دادوەریش ئاگاداری بکاتەوە لەوەی: کەپێویستە نوێژەکەی دوابخات و گوێ بۆ ئەو چەرمەسەریانە رادێرێ. کەبەسەر کوردیاندا هێناوەو نوێژەکەی

دوابخات بۆ کاتی پشوو. لەو دانیشتنانەدا زۆرترو زیاتر ڕوون بووەوە کەسەرانی ئەو ڕژێمە چەند بەستە زمان‌و دەستەوەستان بوون، لەبەردەم سایەمیی گوفتارو ئیفادەی پاکیزەکانی کوردستاندا. لەناویشیاندا سەدام کەلەوان زیاتر خۆی بەشەرمەفەند دەزانی‌و، بێدەنگی‌و شلەژانی‌و خۆکەڕکردنی هەڵبژارد.



## گۆڕی بەکۆمەڵ دوور لەسیاسەت

گۆڕە بەکۆمەڵەکانیش دواجار دەبنە کارتێکی بەهێزتر. لەپاڵ ئەو هەموو کارتانەی لەدۆسیەی ئەنفالدا تاوانبارانی ئەنفالیان پێ ڕووبەڕوو دەبنەوە. وەکو چۆن لەدەستپێکی دادگاییەکەدا ئاماژەدان بەگۆڕەکەی (حەزەر)ی لای موسڵ و؛ ئەوانەی جنوبی عیراقیش، بەشێکبوون لەخاڵە بەهێزەکانی ئەو لائیحەیەی داواکاری گشتی لەبەردەم دادگادا پێشکەشی کرد.

لەهەمووشی گرنگتر ڕاگەیاندنی ئەو پشکنینانە بوو کەشارەزایانی نێودەوڵەتی لەبواری ناسینەوەی ئێسك و پروسك و مێژووی تیاچوونی مرۆڤەکان، ئەو گۆڕانەیان هەڵداوەتەوە دوای پشکنین ناسراوەنەتەوە کەکوردن و لەشاڵاوەکانی ئەنفالدا تیاچوون.. هێنانە ناو دادگای ئەو تیمە هێنانە ناوەوەی بەڵگەیەکی جیهانی زانستی بیانوو بڕترە..

لەئێستادا ئەوەی دەمێنێتەوە ئەو ڕاستیەیە کەسوکاری ئەنفالەکان دوای دەستپێکردنی داداگاکردنی بەشێك لەتاوانبارانی ئەنفال، هێشتا

چاوەڕوانی هێنانەوەی ئێسك و پروسکی ئازیزە لەدەست چووەکانیان، بەتایبەتیش پاش ئەوەی ئەوان و هەمووولایەکیش تێگەیشتن، کەتەنیا کەسێك لەو سەدان هەزار کەسە بەزیندوویی لەسەر ئەرزدا نەماون و زیندە بەچاڵ کران.

سەرباری ئەو حەقیقەتە تاڵ و جەرگبڕانە، جگە لەسزادانی تاوانباران بەهیوای شادبوونەوەن بەجل و ئێسك و پروسکەکان، تاوەکو چیتر گۆڕ غەریب نەبن و لەئامێزی نیشتمانی دایکدا بەرێو ڕەسم و بەدیار کەسوکارەکانیانەوە بەخاك بسپێردرێن.

ئەوەی تێبینی دەکرێ هیچ لایەنێك بەتاسەو جدیەتەوە لەدووی میکانیزمێکی عەمەلی گونجاودا ناگەڕێن بۆ ڕەوانەکردنەوەی ئەو خەمەی کەسوکاری ئەنفالەکان و، لەپاڵیا ئەرکی ئەخلاقی و نیشتمانی خۆیان بەجێ بگەیەنن، ئەمە جگە لەوەی تاکاتی نووسینی ئەم بابەتەش، ڕۆژانە لێرەو لەوێ لەهەواڵی ڕۆژنامەو کەناڵەکانی تری ڕاگەیاندنەوە دەبیستین و دەبینین لەنزیك فلان شارۆچکەی جنوبی عێراق و لەفیسار سەحرای عەرەبستاندا گۆڕی بەکۆمەڵ دەدۆزرێتەوەو؛ زۆرینەی ئەو گۆڕانەش بەجلوبەرگی بەکفن بوویاندا دەناسرێنەوە کەلە کوردە ئەنفالکراوەکانن.

دووبارەو چەند بارەبوونەوەی لەم جۆرە هەواڵانە لەشوێن و بەشێوازی جیاجیاو، ئەجوڵان و ئەبزوانی حکومەت و دەسەڵاتی ئێمە بۆ بەپیرەوە چوون و دانانی ڕێوشوێنی پێویست بۆ هێنانەوەیان وای

لەخەڵك و کەسوکاری ئەنفالەکان کردووە ئەو هیوایەشیان لەلا کزتر ببێ.

لەرابردوودا رێکخراوی تایبەت بەهێنانەوەی گۆڕە بەکۆمەڵەکان لەلایەن وەزارەتی ئاوارەو ئەنفالەوە دامەزرا.

بێ جێیی نابێ بپرسین؛ کوا کارو کردەوەکانیان؟ لەم درەنگ وەختانەشدا تەرمی (٥١٢) قوربانی لەبەرزانییەکان هێنرانەوە کوردستان، ئەویش لەرێگەی سەرکردە بارزانیەکانەوە، مەشوری عەشیرەتەکەی خۆیان خواردووەو کارێکی باشیان کردوە.

بۆیە حەقە بپرسین ئاخۆ کێ لەخەمی هێنانەوی ئێسك پروسکی (١٨٢) هەزار مرۆڤی گۆڕ غەریبی ئەنفالبوودایە.

وەك چۆن شورەییەو نابێ هیچ حزبو لایەنێك ئەنفالو، دۆسیەکەیو، گۆڕە بەکۆمەڵەکان بخاتە چوارچێوەی سیاسەتەوەو، بەو مەرامو بیانوەوە کاریان لەسەر بکات.

ئاوەهاش ناکرێ لەدیدی حزبییانەوە بڕوانرێتە ئەو کۆستە گەورانەو، بەکارهێنانیان لەبەرژەوەندی ئەم لایەن یان ئەو لایەندا. بەتایبەتیش کاتێك بەبیردا هاتنەوە بۆ هێنانەوەیان، دەبێ لەناو خەڵكو، لەکام ناوچەو لەکوێ زۆرترین قوربانی ئەنفالی لێیە، ئالەوێدا بنێژرێن.



## باشترین قەرەبووکردنەوە

زەحمەتە هیچ دەسەڵاتو وڵاتو بانکێکی گەورەی نێو دەوڵەتی بتوانێ بەبارتەقای ئەو زیانو لەدەستدانەی کورد لەئەنفالدا لێی کەوتوە، بەنیوەو بگرە کەمتریش قەرەبوو بکاتەوە.

ئەگەر هەموو کوردستان پڕ بکەن لەخێرو بێری مادی، ئەوا هێشتا ناتوانن بڕێکی باش لەو کاریگەریە خراپو لێکدابڕانو هەڵتەکاندنانەی بەسەر کۆمەڵگای کوردەواریدا لەساڵی هەشتاوهەشتدا هێنرا پارسەنگ بدەنەوە.

جگەلە سوتانو لەناوبردنی ئەو هەزاران گوندو رەزو باخو بێستانو کانیاوو سەرچاوە گرنگانەی ژێرخانو ژیان، لەگەڵ ئەوەشدا لەکوشتنو بێسەرو شوێنکردنی ئەو سەدان هەزار مرۆڤە بێدیفاعە، لاموانیە بەگرتنەبەری هیچ رێو شوێنو بەرنامەیەك چەند گەورەو فرەلایەنیش بێت بتوانێ لەچێوەی ناولێنانی قەرەبووکردنەوەی زیانەکانی شاڵاوی ئەنفالدا جێی خۆی بگرێت.

لەبەر رۆشنایی ئەو راستیانەش پێوستە هەموو لایەك و رای گشتیش ئەو حەقیقەتەیان لەبەرچاو بێت كەبەر لەهەر كەس و لایەك كەسوكاری قوربانیانی ئەنفال كوردوتەنی (گیرفانیان نەدوریوەتەوە)و لەچاوەڕوانی قەرەبووكردنەوەی مادیدا نین.

ئەو ژانە بەسوێیانەش كەهەتا لەژیاندا مابن پێوەی دەتلێنەوە. بەهیچ كەرەستەو تەفاقێكی مادی سارێژ نابێت و تەعویزی لەدەستچوونی ئەو هەموو رۆح و گیان و ژیانەیان كەبەر لەئەنفال تێیدا ئەژییان پێی نادرێتەوە. بەڵام ئەوەی لەم دۆخەدا كەسوكاری قوربانیانی ئەنفال بەپلەی یەكەم مەبەستییانەو؛ چاوەڕوانی ئەكەن. دادگاییكردنی تاوانبارانی ئەنفالە بەشێوازێكی عادیلانە.

هەر ئەوەش لای ئەوان باشترین و شیاوترین قەرەبووكردنەوەیە بۆیان. خۆشیان تەنیا خوازیاری ئەوەن لەبەر چاوی دونیاو هەموو رێكخراوە مرۆڤدۆست و زلهێزەكانی جیهان؛ ئاكام لەماوەی سزادانی ئەو تاوانبارە گەورانەی عیراقەوە بەدرشتی بزانن لەرۆژی خۆیدا چ شاڵاوێكی درندانەی بێوێنە دژ بەهەموو بەهاكانی مرۆڤ و مرۆڤایەتیان بەسەردا هێنرا.

هێشتاش لەناو غوباری ئەو كۆستەو. ژانی ئەو زامە بێ قەتماغانەدا رۆژگار دەیانگوزەرێنێ.

حەقوایە رای گشتی دونیاش بەر لەهەر شرۆڤەو خوێندنەوەیەك. ئەو راستیەیان لا بچەسپێ كەباس هاتە سەر

قەرەبووکردنەوەی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان و، ئەوانەی لە شاڵاوی ئەنفالدا بەهەر بارێکدا زیانیان بەرکەوتوە (بێجگە لەوەی هەموو جۆرە مافێکیان هەیە) باشترین قەرەبووکردنەوە بۆ ئەوان بەر لەهەرشتێکی تر بەرێوەچوونی رەوتی دادگاییکردنی تاوانبارانە بەشێوەیەکی دادپەروەرانەو، بەسزا گەیاندنیانە لەچوار چێوەی یاساو عەدالەتدا.



## کەم، یازیاتر لە١٨٢ هەزار

هێشتا ئامارێکی دروستو تەواو لەسەر ژمارەو: رێژەی هەموو ئەو کۆمەڵە مرۆڤو خەڵکەی ونکرانو تیاچوون لەئەنفالدا لەبەردەستدا نییە.

ئەم کەلێنە دەگەرێتەوە بۆ کەمتەرخەمی حکومەتی هەرێمی کوردستانو ئەو دامودەزگایانەی ئەرکی ئامارو کاروباری ئەنفالکراوەکانیان لەئەستۆ بووە.

چەند هەوڵێکی تاکەکەسیو هیتر دراون، بەڵام گشتگیرو هەمەلایەن نەبوونو نین، کەئامارێکی راستو سەرجەم ناوچە ئەنفالکراوەکانی کوردستان لەگوندو شارۆچکەکانی لەخۆگرتبێ.

ئەو ژمارەیەی براوەتە بالای کۆستی ئەنفال (١٨٢)هەزار، جگەلەوەی ژمارەیەکی سیاسییە، لەناو ئەدەبیاتو نوسینو راگەیاندنیشدا چەسپیوە.

باس کەهاتە سەر ژمارەی ئەنفالکراوەکان بە(١٨٢) هەزار ناودەبرێن. لێرەدا قسە لەسەر کەم یان زۆری ژمارەی قوربانییەکان نییە، بەدەر لەو ژمارەیەی ناوەندە سیاسیو راگەیاندنەکانی کوردستان ئاماژەی پێ دەدەن ئەوەندەش رەمەکی نییەو: نزیکە

لەژمارەی دانیشتوانی ئەو هەزاران گوندانەی بەر شاڵاوەکان کەوتن و سوتێنران و تەختی زەوی کران.

لەماوەی رابردوودا چەندین ناوەندی مافی مرۆڤی جیهانی و کەسایەتی عەرەب و خودی ئەنجامدەرانی تاوانی ئەنفال باسیان لەژمارەی نزیک و هەندێ جاریش زیاتر کردوە لەسەدو هەشتاو دووهەزار.

لەیەکێك لەدانوستانەکانی نێوان بەرەی کوردستانی و رژێمی بەعسدا لەساڵی ١٩٩١، لەوەڵامی داوایەکی سەرکردایەتی کورددا سەبارەت بەچارەنووسی(١٨٢) هەزار کەسی ونبوو لەکارەساتی ئەنفالدا، عەلی کیمیاوی لەو پرسیارەو بەتایبەتیش لەو ژمارەیە سەغڵەت دەبێ و بەتورەییەوە دەڵێ: تێکرای ئەو ژمارەیەی لەئەنفالدا کوژراون لەسەد هەزار زیاتر نەبووە.

(میدڵ نیستووچ) لەراپۆرتی خۆیدا سەبارەت بەژمارەی ئەو کەسانەی لەئەنفالدا لەناو براون، لانی کەمی بەپەنجا هەزار یان رەنگە (١٠٠) سەد هەزار کەسی خەمڵاندووە، کەزۆربەیان ژن و منداڵ بوونە. هەروەها ئاماژە بەوەش دەدات ئەو تیاچوونە لەساتەوەختی شەڕو پێکدادانەکاندا نەبوە.

سەمیر خەلیل کەناوی راستەقینەی نوسەری عێراقی کەنعان مەکیەیە، لەچاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ رۆژنامەی (دی تاگس چای تونگ)ی ئەڵمانی سەبارەت بەکوردەکان دەڵێ: لەلایەن رژێمی

بەعسەوە (١٠٠تا٢٠٠)هەزار مرۆڤی کورد لەناوبراون و زۆربەشیان لەکاتی شاڵاوەکانی ئەنفالدا بووە.

شایەتحاڵێکی گەرمیانیش لەساتەوەختی بردنی ئەنفالکراوەکاندا بەرەو جنوب تەنیا لەدڵی خۆیدا دەپرسێ: خوایە ئەو هەموو قافڵە خەڵکەی دەرۆژە بەسەریەکەوە دەبرێن و کۆتایی نایە بۆ کوێیان ئەبەن!.

کەم یان زۆری ژمارەی قوربانیان کاریگەری ئەوتۆی لەسەر دۆسیەکە نابێت، بەپێچەوانەی هەندێك لەوانەی راڤەی تری بۆ دەکەن.

لەراستیشدا ئەگەر کتومت ئەو ژمارەیەی باس دەکرێت راست دەرنەچێ، ئەوا خودی ئەنجامدەرانی تاوانی ئەنفال دانیان بەسەد هەزارێکدا ناوە کەکوشتونیانن لەئەنفالدا؛ بێگومان سەدان هەزاری تریشیان بەنەخۆشیو بەرتەوازەیی لەئۆردوگا زۆرەملێکاندا ژیان دەگوزەرێنن.



## بەرەو دادگا

دوای ئەوەی لەلایەن دادگای بالآی تاوانەکانەوە بۆ ئامادەبوون لەچەند دانیشتنێکی دادگادا؛ وەکو میوانی چاودێر داوەت کراین بەشداری بکەین لەبینینی چۆنێتی بەڕێوەچوونی رەوشی دادگاییەکە، رووبەڕوو لەناو هۆڵی دادگادا، جۆری مامەڵەکردنەکان لەگەڵ یەکتریداو بەتایبەتیش کەهەندێك لە گفتوگۆو لێپرسینەوەکان لەتەلەفزیۆنەوە پیشان نەدەدران.

بەم مەبەستە رۆژی هەینی ٢٠٠٦/١٠/٦ لەگەڵ هەریەك لە (محەمەد حەمەساڵح تۆفیق، لەتیف فاتیح فەرەج، تەها سلێمان، عومەر محەمەد، عەبدوڵڵا کەریم مەحمود، مەجید ساڵح، سالار مەحمود)، بەو پێیەی ئەم ناوانە لەو کەسانەن لەڕووی نوسین و کاری رۆژنامەوانییەوە، بایەخ بەئەنفال و تراژیدیاکان دەدەن.

کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆ لەسلێمانییەوە بەفڕۆکەی مەدەنی بەرێکەوتین بەرەو بەغدا، بەر لەفڕینی ئێمە شایەتحاڵەکانیش بەفڕۆکەیەکی تایبەت کاتژمێر دوانزەی نیوەڕۆ رۆیشتن. بەر لەوەی بگەینە ناو هۆڵی چاوەڕوانی فڕۆکەخانەکە شایەتحاڵەکانمان بینی کەسێکیان لەگەڵدا بوو بەرپرسێکی حکومەتی هەرێم بوو.

هەر لەدوورەوە بەدەنگێکی بەرز پێی وتین ئەوە شایەتحالەکانم هێناوە! بەبێ حسابکردن بۆ هیچ حاڵەتێک و ئامانەتی پارێزانی وەزیفەکەی، چونکە لەو ناوە ڕێبوارو خەڵکانی تریش هەبوون.

لەوەوە جارێکی تر ئەو قەناعەتەم لازیندوو بووەوە کەئەم کوردە نهێنی و حساباتکردنی وردو هەندێ مەسەلە هەیە نایزانێ و هێشتا زۆرمان ماوە!.

کەفڕۆکەکە فڕۆکەخانەی بەجێهێشت، بۆ یەکەم جارم بوو کوردستان لەئاسمانەوە ببینم، بۆ یەکەم جاریش تێگەیشتم وڵاتەکەم وشک و چۆڵ و کەم سەوزاییەو هێشتا سود لە ئاوو ڕووبارو کانیاوەکانی وەرنەگیراوە بۆ جوانکردنی، تورکیاو ئێرانم لەئاسمانەوە بینیوە چەندە تەڕوو زەمینی یەکپارچە باخ و دانەوێڵەو سەوزایی بوو.

کوردستام لەئاسمانەوە بینی وڵاتی هەژاریکو وشکایی.

یەکەم جاریشم بوو سواری فڕۆکەی عیراقی ببم کەهەرگیزو جارێکیش بەو جۆرە بەخەیاڵمدا نەهاتبوو، ڕۆژێک بێت و فڕۆکەی ئەو وڵاتەی هەموو تەمەنی مناڵی خۆم و خوشک و براو دایک و هاو گوندییەکانمی پڕپڕ کردبوو لەترس و تۆقاندن. بەتایبەتیش بۆ مەبەستێکی وەک ئەوەی ئێمەی بۆ بانگهێشت کرابووین هەرگیز چاوەڕوان نەکراوبوو.

لەوێڵە ئەو گوندەی کەدەکەوێتە قوڵایی گەرمیان و لەساڵی ١٩٨٢ تاوەکو ئەنفالەکان لەوێ نیشتەجێ بووین، هەرکە دەنگی فڕۆکەو

کۆپتەر ئەهات. ڤیژەو هاواری هەمووان، مرۆڤو ئاژەڵی ئاوایی تێکەڵ ئەبوو، ئەو ترس و هاوارە لەگەڵ گەورە بوونما هەر گەورە ئەبوو.

ڤەت ئەو ترس و زەندەق چوونەم لەبیرناچێ: کە(سیروان و سۆران) کاتێک کۆپتەر ئەهاتە سەر ئاوایی و رامان دەکردە ناو (مەلجەئەکەوە) لەناو مەلجەئەکەدا هاواریان ئەکرد، دایە چەقۆیە بکە بەسکمانا بائیتر گوێمان لەو دەنگە نەبێ.

ئەبێ چی لەدەنگی تەیارەو کۆپتەر تۆقێنەرو ترسێنەرو مەرگهێنەرتر بێ؟ بەو پەڕی دڵنیاییەوە هیچ؛ بەتایبەتیش ئەو کاتەی هەست دەکەی دەنگەکە لەسەر سەرتەو خەریکە هەڵتەگرێ یا دەتپێکێ.

نێوان سلێمانی و بەغدا بەسکو پێنج دەقیقە تەیکراو، لەفڕۆکەخانەی بەغدای نێودەوڵەتی دابەزین. فڕۆکەخانەیەکی گەورەو سەربازگەیەکی گەورەی ئەمریکایی و ناوچەیەکی پارێزراو لەمەترسی تیرۆرو تیرۆریستان.

لەوێوە بەرەو ناوچەی سەوز بەڕێکەوتین حاکم ئەحمەدی ئەندامی پەرلەمانی عیراقی هاوەڵمان بوو، ماوەی ئەو ڕێگایە تادەگەیتە ناوچەی سەوز بەڕێگای مەرگ ناسراوە، بۆیە بەخێراییەکی زۆر ئەو ڕێگایە تەی کرا، چەندین پرسگەی سەربازی ئەمریکیمان تێپەڕاند.

لەیەکێک لەبازگەکاندا سەگی پۆلیسی پشکنینی ئۆتۆمبێلەکە بەتوانجەوە بەهاوەڵەکەمانی وت: جەنابت نوێنەری شەعبی‌و سەگێکی سەرو ستمان ئەپشکنێ، ئەمە کەی حکومەت دارییە، ئەمە کەی سەروەریە ئێوە هەتانە. ناوچەی سەوز؛ ناوچەیەکی دابڕاوە لەتەواوی ناوچەکانی تری پایتەخت.

هەرکەس‌و شۆفێرێك کارتی تایبەتی پێنەبێ ناتوانێ داخڵی ئەو ناوچەیە ببێ، چونکە جگەلە مام جەلال کەبارەگاکەی بردۆتە دەرەوەی ناوچەی سەوز. هەموو حکومەت‌و پەرلەمان‌و دەزگاکانی دەوڵەت‌و سەفارەتەکان‌و ماڵی بەرپرسان لەوێ کۆبوونەتەوە، بەبینای دادگاییەکەشەوە.

لەناوچەی سەوز لەوبەری شوقەکانەوە بەدرێژایی هەزاران مەتر بینای نوێ‌و باڵەخانە دروست دەکران، یەکێك لەهاوەڵەکانمان پێی ڕاگەیاندین ئەو بینایانە بۆ باڵوێزخانەی ئەمریکایەو؛ وا بڕیارە بۆساڵی ٢٠٠٧ تەواو ببن‌و گەورەترین سەفارەتی ئەمریکایی دەبێت لەهەموو جیهاندا. لەوەوە دڵنیاتر بوومەوە کەجێهێشتنی عیراق لەلایەن ئەمریکاییەکانەوە بۆ چەندین ساڵی تریش بەشێکە لەمەحاڵ باس لەوەش کرا؛ کەسەفارەتە نوێیەکە پێنج هەزار کارمەندی پێویست دەبێت بۆ کارکردن تێیدا.



## دیداری دادوەر محەمەد خەلیفە ئەلعرێبی

بەمەبەستی گەیاندنی پرسەو سەرەخۆشی لێکردنی بەهۆی لەدەستدانی زاواکەیەوە کەتیرۆریستان لەپەلامارێکیاندا کوشتبوویان و خوشکەکەی دادوەریش بریندار ببوو، هەر ئەو ڕۆژەی گەیشتین بۆ شەوەکەی سەردانی ماڵی دادوەر محەمەد خەلیفە ئەلعرێبی مان کرد. ئەوەشمان بە فرسەت زانی بەناوی خەڵکی کوردستان و کەسوکاری ئەنفالکراوەکانەوە، سەرەخۆشی لێبکەین و هەڵوێستە پاسایی و عادیلانەکانی بەرز بنرخێنین، هەروەها دەرفەتێکی باش ڕەخسا بەکراوەیی باسمان لەواقیعی تێڕوانین بۆ ڕەوشی دادگاییەکەو ڕای خەڵکی کوردستان لەسەر ئەدائی دادوەر خۆی و، ئەو تێبینیانەی هەمانبوو بەوردی و بەڕوونی خستمانە ڕوو، دادوەر پێی خۆشبوو بزانێ؛ کەخەڵکی کوردستان لەچ ئاستێکدا موتابەعەی بەڕێوەچوونی دانیشتنەکانی دادگاییەکە دەکەن.

دیاربوو مەبەستیشی بوو کەگەل کوردو کەسوکاری ئەنفالەوکان لێی رازی بن لەسەر پاراستنی عەدالەتی دادگاکەو لانەدان لەرێوتوە یاساییەکەی.

لەو سەردانەدا بەڕوونی هەستمان بە نیگەرانیو موعاناتی دادوەرەکە کرد. لەباری هەبوونی ململانێی تایەفی کەلەعێراقدا بەجۆرێك پەرەی سەندوە. گەیشتۆتە ناو دەستەی دادگاکەش. ئەو وای پیشان دەدا کەئەو ئەندامانەی دەستەی دادگاییەکە کەلەعەرەبی سوننەن، هەندێ جار کێشەو گرفتی بۆ دروست دەکەن.

لەکاتێکدا رائد جوحی سەرۆکی هەیئەی دادگای باڵای تاوانەکان لەعەرەبی سونەیە.

لەماڵی داوەردا سێ کەس لەیاریدەدەرەکانی لەوێ بون بەر لەوەی هەستین یەکێك لە یاریدەدەرەکانی بەپێکەنینەوە وتی سەدامو ئەوانی تر لە ئەنفالدا دەرباز نابن.

محەممەد ئەلعرێبی زۆر بەراشکاوی باسی لەکاریگەریەکانی کارەساتی ئەنفالکرد: لەسەر هەستو بیری لەبەرامبەردا وتی بەو دەربڕینانەی شایەتحاڵەکان هێندەی تر ئاستی زوڵمو تاوانباریکو بێبەزەیی سەدامو دارو دەستەکەیم زیاتر لا دەچەسپێ. بەڵام ئەمە ناهێڵم کاربکاتە سەر پاراستنی بێلایەنی دادگاییەکە. ناشهێڵم بکەومە ژێرباری سۆزەوە.

باسی ئەوەیشی کرد دۆسیەی ئەنفال دۆسیەیەکی زۆر دەوڵەمەندە بەبەڵگەی زیندووی هەمە لایەنە.

دیمەنێك لەماڵەکەی ئەو حاکمە عەرەبەدا زۆر سەرنجمی ڕاکێشاو پرسیارێکی جەوهەری لامدروست کرد. ئەویش بینینی وێنەی مام جەلال بوو بەهەڵواسراوی لەسەرووی ژوورەکەدا.

وەکو کوردێك زۆر کەیف خۆش بووم بەو دیمەنە. چونکە لەوەوە تێگەیشتم کەمام جەلال لەبەغداش هەر زوو توانیویەتی بچێتە ناو دڵی خەڵکەوە.

## بینینی صدام لەهۆڵی دادگادا

رۆژی ٢٠٠٦/٦/١٠ بەیانیەکـەی لەبـەردەم بینـای ئەنجومـەنی نوێنەرانی عیراقیەوە بەسەیارەی تایبەتی دادگاکە، کەپاسێکی داخراو بـوو، لەگـەڵ چـەند کەسـێکی بیانیـدا بردینیـانین بـۆ دادگاکـە لـە رێوشوێنێکی ئەمنی زۆر چڕوپڕدا گەیشتنینە ئەوێ.

تانـاو هـۆڵی دادگاییەکـە چـەندین فلتـەری پـشکنین هـەبوو؛ بەئامێری نوێ.

کاتژمێر نۆو پەنجا دەقیقە گەیشتینە نـاو هۆڵی دادگا لەبەشی سەرەوەی هۆڵەکەدا شوێنی میوانـەکان بـوو، میوانـەکان بریتـی بـووین لـە نـۆ کـوردو حـەوت بیـانی؛ کەپرسـیارمان کـرد؛ ئـەم بیانیانـە چ کارەن؟وتیان نوێنەری دادگای ئـەوروپی‌و، دادوەریی بیانی‌و نوێنـەری رێکخراوی مرۆڤ دۆستو؛ بەرپرسی یاسایی سەفارەتەکانن.

بەر لـەوەی دانیشتنەکە بکرێتـەوە لەشـوێنی خۆمـان دانیشتین‌و هەرکەسـەو ئـامێری گوێگرتنیـان (هیتفـۆن) داینـێ، کەچـوار کـەناڵی هەبوو، کەناڵی سفردەنگی ناو قاعەکەی دەگواستەوە، کـەناڵی یـەك بـۆ زمانی عەرەبی، کەناڵی دوو بۆ زمانی کوردی ، کـەناڵی سـێ بـۆ زمـانی ئینگلیزی بوو.

جامخانەیەکی شوشـەیی بەشـە میوان‌و هۆڵەکـەی جیـا دەکـردەوە، واتە ئێمە لەو دیو شوشەکەوە دەمانتوانی هەمووان ببینین.

لەهەر چوار گۆشەی سەرەوەی هۆڵەکەدا کامێرای تەلەفزیۆنی بۆ رووماڵکردنی هۆڵەکە هەڵواسرابوو دیابوو وێنەی بەرێوەچوونی دادگاییەکە لەو کامێرایانەوە دەگوازرانەوە.

هەروەها هۆڵەکە دوو سورەیای گەورەو چواری بچوکتر لەگەورەکانی لەسەقفەوە بۆ خوار تیا هەڵواسرابوو. هەموو ئەو کورسیانە لە هۆڵەکەدا بوون؛ بەنەوانەی کەنێمەیشی لەسەر دادەنیشتین هەمووی کورسی دەوار بوون. بەڵام کورسی تۆمەتبارەکان نەجوڵاوو پێداربوون‌و پێکانیان نیستیل بوو. بۆ هەر یەکێك لەخانەی قەفەسی تۆمەتبارەکانەوە جیهازی مۆنیتەر دانرابوون؛ بۆ ئەوەی لەکاتی پیشاندانی هەر بەڵگەیەك یان نوسراوو وێنەیەك لەشاشە گەورەکەی ناو هۆڵەکە؛ لەنزیکەوە بەرِوونی ببینن.

بۆ تۆمەتبارەکانیش مایکرۆفۆن دانرابوو. ئەمە جگە لە ناوی مەعدەنی‌و پاکەتی کلینکس کە بۆ تۆمەتبارەکان لەسەر ئەرز لەتەنیشت کورسیەکانیانەوە دانرابوو.

ساتێکی خۆش‌و لەچاوەروانیەکی سەریردا بووین. سات لەدوای سات لەبەدیهاتنی ئەو خەونە نزیك دەبوومەوە. کەلە رووداو ئەوەی بۆی هاتبووم ببینم. ئەمە چ چرکە ساتێکە گەورەترین دیکتاتۆرو دژە مرۆڤ و خاوەن پیلانی کورد فڕکەرو کوردستان وێرانکەر بەبەر چاوەوەو رووبەروو ببینی لەکوێدا لەهۆڵی دادگاداو ئەو کاتەی دەخرێتە بەردەم لێپرسینەوە بەرامبەر یەکێك لەهەرە تاوانە

بینینەو ترسناکەکان کەتاوانی ئەنفالەو، بۆ خۆم و [illegible] ئەمەی تاوانەکە روو دەدات لەناو سات بەساتی ژان و هاوارو لەدەستەکانو دابڕانەکانیدا ژیاوم. پاش یەك کاتژمێری تەواو، واتە لەکاتژمێر دەو پەنجا دەقیقە بەدەنگی (محکمە) دادگاییەکە کرایەوە.

دوای هاتنە ژوورەوەی دەستەی دادوەران و داواکارانی گشتی و پارێزەران، بەدەنگی بەرز بانگی موتەهەم سەدام حسین کرا بۆ ئامادەبوون و هێنانە؛ بینینی سەدام بۆ من و بەو جۆرە خەونێکی گەورەبوو، چونکە ئەو کەسێك بوو لەوەتەی لەدەرکەوتن و پیشانداندا بووە لەشەستەکانەوە تا بۆ دواجار دوو رۆژ بەر لەداڕووخانی دەسەڵاتەکەی لەیەکێك لەشەقامەکانی بەغدا، سەرباری ئەو هەموو زوڵم و ناعەدالەتی ماڵوێرانییەی بەسەر خەڵکیدا هێنای، خۆی بەگەورەترو عادلترو بەویقارتر دەزانی لەیاساو خەڵك و مرۆڤایەتیش.

صدام حسین هاتە ژوورەوە؛ قاتێکی رەش و کراسێکی سپی لەبەردا بوو، قورئانێکیشی بەدەستەوە بوو، بەجۆرێك هەنگاوی دەنا وەکو ئەوەی پیشانی بدات؛ کەهێشتا عەزمی تیا ماوە. بەڵام شڵەژاوی سەرو سیمای و رەنگی زەرد هەڵاتووی نەدەتوانی بشارێتەوە، چونکە وەکو دادوەر محەمەد ئەلعرێبی باسی کرد دەوڵەمەندی بەڵگەکانی دۆسێی ئەنفال بەجۆرێکە تۆمەتبارانی هێناوەتە شۆك.

سەدام لەسەر کورسیەکەی خۆی لەپێشەوە دانیشت. بەدوای ئەویشدا سوڵتان هاشم و فرحان متلگ الجبوری و حسین رەشید و صابر

عەبدولعەزیز حسین ئەلدووریو تاهر تۆفیق یوسفو عەلی حەسەن مەجید؛ کەدواین کەسیان بوو، بەگاڵۆکێکەوەو دشداشەیەکی قاوەییو عەگاڵێکی سوورەوە لەهەموویان هیلاکتر دیار بوو هاتە ژوورەوە.

لەوە بەدوا دادوەر بانگی کرد شایەتحاڵ بێتە ژوورەوە. شایەتحاڵ ژنێکی خەڵکی گوندی کۆرەمۆری سەر بەناحیەی قادر کەرەم بوو، ژمارەی ئیفادەکەی (١٤١٢) بوو.

سەدام داوای لە پاسەوانەکان کرد کە دەفتەری تێبینی نوسینی بۆ بهێنن بۆ یان هێنا، بەڵام دادوەرەکە ئاگاداری کردەوەو پێی وت نابێت لەخۆتەوە داوا لە پاسەوان بکەیت بۆ هەر شتێك. هەر داوایەکی ئینسانی یان پێویستیەکتان هەیە بە خۆم بڵێن. بۆتان جێبەجێ دەکەم. دیاربوو صەدام دەیویست لەو سەرەتایەوە رەوتی دادگاییەکە بگۆڕێ بەپشێوی. چونکە دواتر کەوتە قسەکردن لەگەڵ سوڵتان هاشم کەتەنیشتیەوە لای دەستەراستی دانیشتبوو. جارێکی تر دادوەر ئاگاداری کردەوەو بێدەنگ بوو. چەندین دیمەنی سەیرو سەرنج راکێش، کەشایانی لەسەر وەستانی زۆرن لەو هۆڵەدا رووی دەدا.

دادوەریش بەشێکی زۆری ئەو دیمەنانەی دەبچڕاند. تاوەکو بڵاو نەبنەوە لەتەلەفزیۆنەوە. لەبەر ئەوەی تاکاتی نوسینی ئەم بابەتە دادگاییەکە کۆتایی نەهاتووە. بۆیە لەرووی یاسایی‌و پاراستنی ئسوڵی میوانداریەکەی ئێمە؛ نەگونجاوە قسەیان لەبارەوە بکەین.



# فرمێسکەکانی کەمارا لەهۆڵی دادگادا

لەدانیشتنی سیانزەهەمینی دادگادا، دوای ئەوەی دادوەر داوای کرد شکایەتکاری چوارەم بێتە هۆڵەکەوە، شکایەتکار کەوتە گێڕانەوەی ئەو بەسەر هاتانەی بەسەر خۆی و کەسوکارو گوندەکەی و خەڵکەکەیدا هێنراوە؛ لەمانگی چواری ساڵی هەشتاو هەشتدا لەلایەن جەیشی عێراقییەوە، بەشێوەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێش و تەفەڵ دوور ڕووداوەکانی تەمتەڵە دەکرد، جگە لەو هەموو دەردە سەریەو، ویرانکردنی گوندو ڕاپێچ کردنیان بەرەو گرتوخانەکانی دووبزو؛ تۆپزاوەو؛ دابڕینی لەکەس و کارەکەی و برسێتی و نەخۆشی و مردنی مناڵ و گەورەو بچوک لەو دەوروبەریدا.

جەلادەکانی بەعس بەوەشەوە نەوەستان، تادەستدرێژی سێکسی بکەنە سەریان و بەزۆرو جەور پاکیزەییەیان لەبارودۆخێکی تەواو تەواو شێواودا لەکەدار بکەن. شایەتحاڵ بەجۆرێك ئەو رووداوانەی بەسەریدا هێنراو، ئەو کردە بێزراوانەی بەچاوی خۆی بینیبوونی لەهاوخوشکەکانی کراوە دەگێڕایەوە، خودی دادوەر (محەمەد العرێبی) پەساپەسا لەنارەحەتی و نیگەرانیدا بەدەستەسرە کاغەزیەکەی بەردەستی نارەقی ناو چاوانی و سیمای دەسڕی. دیاربوو جگە لەحاڵەتە ئینسانی و کاریگەرییەکانی. وەکو عەرەبێکیش شەرمی لەخۆی و نیگەرانی لەو تاوانانەی کەبەجۆرێك لەجۆرەکان کەلتوری شۆڤێنی عەرەبی راستەوخۆ لێی بەرپرسیارەو کاراکتەریەتی دەکرد، ئەوەی بەلای منەوە لەهەموو دیمەنەکان سەرنج راکێشەرتر بوو، لەو کاتەدا کەکچە شایەتحاڵەکە دەردە سەریەکانی خۆی دەگێڕایەوە، کەمارا خان. ژنێکی ئەمریکی بالآبەرزی سپی پێستی قژ زەردی تەمەن دەوروبەر ٤٠ ساڵان بوو. کەمارا هەموو بەیانیەك لەبەردەم تەلاری ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقیدا چاوەڕێی دەکردین و ئەو سەرپەرشتی بردن و گەڕانەوەی ئەو کەسانەی دەکرد، وەك میوان بەشداریان دەکرد لەبینینی رەوشی دادگاییەکەو، دەیبردین؛ لەگەڵمانبوو تاکاتی گەڕانەوەش.

خاتوو کەمارا لەناو ئەو هۆڵەی ئێمەی تیادا دەنیشتین هەر لەگەڵمانا بوو، بۆ هەر یەکێك لەمیوانەکان جیهازی (هێت فۆن)

دابەش دەکرا ئەو جیهازە بۆ وەرگێڕانی قسەو شکایەتو گفتوگۆکانی ناو دادگاییەکە بوو کەبەچەند زمانێك وەردەگێڕدرا.

جیهازەکە چوار کەناڵی هەبوو (کەناڵی سفر – بۆ دەنگی عامی ناو هۆڵەکە بوو – کەناڵی یەك وەرگێرانی گفتوگۆکان بوو بۆ زمانی کوردی – کەناڵی دوو بۆ زمانی عەرەبی و کەناڵەی سێ بۆ زمانی ئینگلیزی بوو.

کەماراش لەگەڵ ئێمەداو لەکورسیەکانی دواوە دادەنیشت. وەك هەمووان هیت فۆنەکەی لەگوێ دەکرد. شایەتحاڵەکە لەگەرمەی گێڕانەوەی ئەو رووداوە بیتراوانە بوو کەبەسەریدا هاتبوو. لەپڕدا ئاوڕێکم دایەوە بۆ دواوە بینیم کەمارا فرمێسك بەچاوەکانیدا بەخوڕ دێنە خواروو؛ لوتو گۆناکانی سورسور هەلگەڕابوون.

ئەم دیمەنە منیشی خستە حاڵەتێکی هێندەی تر نائارامەوەو، دڵم پڕ پڕو ئەندێشەشم پڕ پرسیار، ئەو کاریگەریە ئینسانیەی کاری کرد بووە سەر دەروونی ئەو ژنە بیانیە ئەبێ ببێتە پرسیار، بۆ ئەو ژینگەو کەلتوورەی ئەوی پەروەردە کردوە.

ئەمە لەکاتێکدا تەنیا تاوانبارەکان بوو، نەك هەر ئەو گێڕانەوانە کاریگەری ب

نەدەخستە دەروونو ویژدانی مرۆیانەوە بەڵکو گوێی خۆیان لەو قسانە کەڕ کردبوو، نەشیان دەویست گوێ بۆ گێڕانەوەی رووداوێکی لەو جۆرەی. کەخۆیانو دارودەستەکەیان بکەری بوون بگرن.

کەمارا هەر لەدوورەوە کەدەمانبینی بەدەم[illegible] پڕ لەپێکەنین‌و بزەوە پێشوازی لێ دەکردین‌و لەگەڵماندا لەپاشی [illegible] (مصفحە) کەدا سەردەکەوت تا دەگەیشتینە دادگاو لەوێشەوە لەکاتی پشووی نان خواردن‌و گەڕانەوەشدا هەستی دەکرد تەنیا هەمووگیانی لەجووڵەو بزەو خەندە ئاڵاوە، ئەمزانی لەگەڵ ئەوانەشدا بەوڕادەیە هەستێکی مرۆڤانەی تراژیدیا قوڵ کارتێکردوو کەخوڕخوڕ فرمێسک لەچاوەشینەکانی دابارێ ئاوا کاری تێبکات.. سوپاس‌و ئەمەک بۆ ماندو بوونی کەمارا لەگەڵمان،وەفاو پێزانین بۆ فرمێسکە گەرمەکانی.



# کوردستانی نوێ و عەبدوڵڵا کەریم مەحمود لەهۆڵی دادگادا

عەبدوڵڵا کەریم مەحمود، یەکێك بوو لەئەندامانی وەفدەکەی ئێمە، کەمیوانی دادگاییەکە بووین.

وەکو رۆژنامەنووسێك زۆربەی بەرهەمەکانی لەسەر ئەنفال و کیمیاباران و تراژیدیایەو خاوەنی کتێبی (رەشەبای ژەهرو ئەنفال)ە، لەو لایەنەوە خزمەتێکی باش کردوە،

دادوەر بانگی شایەتحاڵی یەکەمی کرد بەناوی عەبدولخالق قادر عەزیز خەڵکی گوندی وارانی ناوچەی ئەوجول. زۆربەی کەسوکارەکەی ئەنفال کراوە، سکاڵا کار لەرێگەی بەڵگەنامەیەکەوە؛ کەناوی خوشکێکی تێدایەو. بەپێی ئەو نوسراوە هەژدە کچی کوردی ئەنفالکراو لەلایەن ئەمنی کەرکوکەوە فرۆشراون بەوڵاتی میسر.

لەناو ئیفادەکەیدا داوای کرد چارەنوسی خوشکەکەی دیاری بکەن و، لەو بەڵگەنامەیە بکۆڵنەوە.

پاش ئەوەی تاوانبار عەلی حەسەن مەجید لەشایەتحاڵەکەی پرسی کەئەو بەڵگەنامەیەت چۆن دوست کەوتووە: هاتە وەڵام کەلەرۆژنامەی (کوردستانی نوێ ) دا خوێندویەتیەوە..

تائێرە گێرانەوەی ئەو گفتوگۆیانەی شایەتحاڵ و تۆمەتبار بوو. بەڵام ئەوەی بەلای ئێمەوە گرنگبوو، ناوهێنانی بەرهەمێکی رۆژنامەنوس عەبدوڵلا کەریم مەحمود بوو، بەتایبەتی خۆی زۆری پێ خۆشبوو کەبەمکێك لەهەوڵ و بەرهەمەکانی بووەتە بەڵگەو لەناو دادگادا بەرووی تۆمەتباراندا دەدرێتەوە، ئەمە جگە لەرووی بەشداری کردنی رۆژنامەی کوردستانی نوێش بۆ پاڵپشتی شایەتحاڵەکان و، ئامادەکردن بەرۆژنامەکەو چوونە نێو دۆسیەی ئەنفالەوە بۆ خۆی شانازیەکە بۆ رۆژنامەکە. ئەمەش دەرفەتێکە کە نەك لەرابردوودا ، بەڵکو بۆ ئێستاش بایەخی ئەو رۆژنامەو؛ گرنگیدانی بەمەسەلەکانی پەیوەست بەئەنفال و بەتایبەتیش دانیشتنەکانی دادگا بەرز دەنرخێنم.

جار جارە ئەگەر بەهۆی سەرقاڵییەوە نەمتوانم روو بەرووو لەتەلەفزیونەوە دانیشتەکانی دادگا ببینم. باشترین سەرچاوە کوردستانی نوێیە بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەو لەدەست چوونە. چونکە بۆ رۆژی دواتر بەنوسین بلاویان دەکاتەوە. ئەمەش لەهیچ رۆژنامەیەکی کوردی و عەرەبیدا بەدی ناکەم.

لەئاکامدا بۆ مێژوو ئەم گرنگیدانەی کوردستانی نوێ هەم وەک بابەتێکی زیندوو، هەم وەک ئەرشیفێکی نوسراو جێیەکی تایبەتی دەگرێ.

عەبدوڵلا کەریم پێوەی دیاربوو خۆشحاڵ بوو بەو ساتەوەختەی کەهەستی دەکرد جێدەستی دیار بووە لەدادگادا، زۆرتریش لەبەرئەوەی خۆیشی لەبەغدا بوو.



# حەجاجی بەعس

ناخۆشترین و بارگرانترین ناوی جەللاد لای ئەو کەسانەی برانە نوگرەسەلمان، ناوی ((حەجاج))ە.

حەجاج بەرپرسی گرتوخانەی نوگرە سەلمان بووە، مامەڵەی لەگەڵ راگوێزراوەکاندا لەو پەڕی درندەیی و بێبەزەییدا بووە.

لەدانیشتنی یەکەمی رۆژی دووەمی ئامادەبوونی ئێمە لەهۆڵی دادگادا. یەکێک لەپاکیزە شایەتحاڵەکان، گوزەرانی خۆی لەو ماوەیەی لەوێ بوو بۆ دادگا دەگێڕایەوە.

زیاد لەجارێک کەناوی حەجاجی دەهێنا، لەگەڵیا ئاهێکی قوڵیشی هەڵدەکێشا، هەر کەهاتە سەر گێڕانەوەی ئەو دەستدرێژیانەی کراوەتە سەری، دادوەر دەستی خستە سەر سویچە سورەکەی بەردەستی؛ بۆ ئەوەی دەنگ و رەنگی دانیشتنەکە نەگوێزرێتەوە بۆ راگەیاندنەکان.

لەوێوە کچەکە باسی ئەوەی کرد؛ کەچۆن شەوانە خەوجاج و یەک دوو کەس لەپاسەوانەکانی هاتوون و، لەجوانترین کچەکانیان هەڵبژاردوە؛ بردوویانە بۆ لای خۆیان، بەدەم گریانەوە وتی: منیش بەو دەردە برام و زۆر دڕندانە سوکایەتیان پێکردووم و بێ شەرمانە ئارەزووەکانیان بەتاڵکردۆتەوە.

لەو گێڕانەوەیەدا قاعەکە پڕ بوو بوو لەبێدەنگی .خودی محەممەد العریبی عارەق بەناو چاوانیدا دەهاتە خوارەوەو ملی خۆی پێ ڕانەدەگیرا؛ لەحەسرەت و شەرمدا بەدەستە راستی ئارەقی ناو چاوانی دەسڕی. دوای چەند دەقیقەیەکی تر بەهەردوو دەست.. داوەرەکەی دەستەچەپی محەممەد العریبی لەژێر عەینەکەکەیەوە فرمێسک بەچاوەکانیدا دەهاتە خوارەوەو زوو زوو دەیسڕیەوە.

شێوازی گێڕانەوەی شایەتحاڵەکە زۆر کاریگەر بوو، بەتایبەتیش بەعەرەبی ئیفادەی دەداو، زمانەکەی دەزانی عەرەبیەکەیشی لەباشترین عەرەبی زانەکان بوو. کچەکە جگە لەزانینی لەزمانی عەرەبی بەباشی، پێدەچوو ئاگایەکی باشیشی لەئەدەبیاندا هەبوو بێ، چونکە بەزمانێکی پاراوی ئەدەبیش باسی لەمەینەتیەکان دەکرد.

ئەمە وای کرد لەرووی دەروونیەو ویژدانیەوە کاریکاتە سەر سۆزی ئامادەبوانی هۆڵەکەو پێیانەوە دیاربێ.

شایەتحاڵەکە لەیەکێك لەقسەکانیشدا وتی: هەندێ جار ناوی (حەجاج) یان بە (ابو یوسف) یش بردو خەڵکی دیوانیە بوو. دیارە حەجاج بەمانای رەشەبا، یان باوتۆز دێت..

جگە لەوەش لەیەکێك لەدانیشتنەکانی تردا، شایەتحاڵ عەبدوللا سەعید ئەحمەد کەخەڵکی گۆپتەپە بووە، لەبەر خراپی گوزەرانیان لەگرتوخانە دەڵێ: رۆیشوینەتە لای حەجاج باسی ئەوەمان کردوە بۆی کەژیانمان لەبەر نەخۆشکو نەبونی خواردن و پیسی لەمەترسی زۆردایەو، وا بڕوا هەمووومان دەمرین.

حەجاج لەوەڵامدا پێی وتوون: ئێوە بۆ ئەوە هێنراونەتە ئێرە کەبمرن. ئێوە بۆ ژیان نەهاتونەتە ئوگرە سەلمان.



## کارتی کورد:

# لەدادگایی کردنی جەللاددا

دەرکەوتنەوەی سەرانی گەورەی رژێمی لەناوچووی بەعس و، ئەم جارەیان لەبەردەم دادوەری لێکۆڵینەوەی عێراقیدا، لەهەر رەهەندێکەوە تێی بڕوانرێ و، خوێندنەوەی بۆ بکرێ. ئەوا هیچ بایەخی کەمتر نییە لەرۆژی رووخاندنی خودی رژێمەکەو خستنی پەیکەری گەورەی خودی سەدام حسێن. دواتریش دەستگیرکردنی خودی گەورە دیکتاتۆرو هاوەڵەکانی.

رووداوەکان لەشێوەی وێنەی بەدوای یەکدا هاتووی فیلمێک دەچن، وەك تەقەڵ دووری کراسێك.

ئەم دیمەنەی کەقسەی لەبارەوە دەکەین تائێستا سەرنج راکێشترین وێنەیە، لەکاتێکدا هێشتا بەناکام گەیشتنی ئەم دەرکەوتنە چەندین وێنەی تر لەگەڵ خۆی و بەدوای خۆیدا دەهێنێ.

ئەم دەرکەوتنە نوێیە وەك سەرەتای گۆڕانێکی تازە لەژیانی سیاسی و دەسەڵات و جۆرێدا دێتە بەر دیدە، گۆڕانێك؛ کەتەنیا حاکمانی هاوشێوەی جەللاد و قوتابیەکانی بەعسیزم لەهەمبەریدا توشی دڵە راوکێ ئەبن، ئەگینا بۆ گیانکردنەوە بەبەهای مرۆڤ و

ژیانــدا بــۆ کــوردو عیراقیــەکان، لەهــەرە گــرنگترین دەسکەوتەکان دەژمێردرێت.

پەلکێشکردنی گەورەترین دیکتاتۆری سەردەمی نوێ بۆ بەردەم دادگــاو، هەڵدانــەوەو پیاچــونەوەی فایلــە دزێوەکــانی، هەڵــدەگرێ لەچەندەها دیوەوە تەفسیری جیاو خوێندنەوەی یەکتر تەواوکەری بۆ بکرێ. لەبەر ئــەوەی لەجەوهــەردا چەندین مانــاو مــەدلولی تازە بــۆ بەرێوەچــوونی دەســەڵات لــەعیراقی داهــاتوو، هــەروەها جــۆری پیــادەکردنی دەســەڵات لەلایــەن وڵاتــانی ناوچەکەشــەوە لەئێــستاو ئاینەدا لەدەور کۆبوەتەوە.

بۆیە وەکو کورد ناکرێ بەڕاگوزەری یا بەتەنیا وەك رووداوێك بێ هەڵوەســتەکردنی ئاگایانــەی تــەواوو بــەبێ قــسە لەبارەکردنیــەوە بەسەرماندا تێپەڕێ. بۆ دەسەڵاتدارانی ناوچەکەش ئەوانــەی مــاكو رۆحییەتی جەلادو بــەعس ئاسا لەخەیاڵدانیانــدا مەڵاسی خــواردووە، زەنگێکــی هوشــیارکەرەوەو، مایــەی پێداچونەوەشــە بــەخۆدا (وەك دەسەڵات).

سەرەتایی ترین دەلالەتیان لەوێوە رێچکە دەگرێ: کە دەســەڵاتەکە هەرەس دێنێ، بەعس وەکو تاکە حیزبو سیستەم هەڵدەوەشێتەوە، سەرۆکی خاوەن هێزو ترسێنەر لــەکار دەخرێو لەپایــە دەهێنرێتــە کون، ئینجا وەك تاوانبارێکی بێ ورەو ترسنۆك پەلکێشی بەردەم دادگا دەکرێت.

ئەگەر ئەمە باگراوندی ریشەکێشانی بەعسیزمی بە شمولی لەپشتەوە بێتو بەبەردەوامی لەناو پێکهاتە جیاوازەکانی کۆمەڵگەی عیراقیدا، بەکوردستانیشەوە ئیشی لەسەر بکرێ، ئەوا ئومێدی زیاتری بەدواوەیە.

لەئاکامدا چینو توێژەکانو خەڵکانی زیان لێکەوتووی دەستی دامودەزگا داپڵۆسێنەرەکانی ئەو رژێمە ئەتوانن بەئاسانی لەنزیکترین مەودای کاتو جێدا، بەدەستو دەمی خۆیانو لەروو سکاڵای خۆیان بخەنە بەردەست دادوەرو پێشکەشی دادگای بکەن.

حیساب نەکردن و دانەنانی سەدام حسێنو داروودەستەکەی وەکو دیلی جەنگ. بەدیوێکی تریشدا، نەگواستنەوەی دۆسیەی دادگایی کردنەکەی بۆ دادگایەکی نێودەوڵەتی (هەندێك کەسو چاودێر پێیان وایە دادگاییەکە نێو دەوڵەتی بوایە باشتر دەبوو).

دوو خاڵی گرنگو کاریگەرن بۆ ئایندەی ناوچەکەو عیراق کە ئەم خاڵەیان لەهەردوو قۆناغەکانی پێشووتر، واتە رووخانی رژێمو دەستگیرردنی دەسەلاتدارانی، پر بایەخترە، بەتایبەتی بۆ هەموو خەڵك، کەدەتوانن راستەوخۆ رووبەرووی ئەو تاوانبارانە ببنەوە کەچەندەها ماڵوێرانیو کارەساتو فرکردنیان بەسەردا هێنانو شکایەتیان لێبکەن.

وڵاتــانی زیــان بەرکــەوتووی سیاســەتی رژێمــی بــەعس ئەگــەر لەدادگای نێودەوڵەتی سکاڵای یاسایی تۆمار بکەن ئەمــەیان پاڵپشتێکی ترە.

بــۆ خــەڵکی کوردســتانیش ئــەم دادگــایی کردنــە خــاڵێکی هــەرە جەوهەریــە هــەر لەهاتنەســەر حــوکمی دەســەڵاتی بــەعس لەڕێگــەی کودەتــاو بــەزۆر خــۆ ســەپاندنیەوە تــا ئــەو ســاتەوەختەی رەمــزی دەســەڵاتی دیکتاتۆرییــەت لەبەغــدا هێنرایــە خــوارەوە کــورد هــەم هێزێکی کاریگەرو هەم فاکتەرێکی پتەو بووە.

بۆ رووبەڕوو بوونەوەی ئەو ناعەدالەتیو رەفتارە نامرۆڤانەیــەی کەئــەو رژێمــە لــەماوەی حــوکمی خۆیــدا بەســەر خەڵکیــدا دەیهێنــاو لەرێگــەی زەبــرو زەنگــەوە جڵــەوی دەســەڵاتەکەی دەکێــشا، واتــە بەدرێژایی حوکم و زەبرو زەنگی بەعس. گیانی بەرگریو بەرخودان لــەناو بزوتنــەوەی کوردایەتیــدا دژ بــەخودی رژێمەکــەو دامودەزگــا داپڵۆسێنەرەکانی بــاڵای کــردووەو؛ بــەردەوام لەخەباتــدا بــووە لــەپێناو ئــازادیو گــۆڕینی رەوتــی دۆخو دەســەڵات لەکوردســتانو عیراقیــشدا لەدیکتاتۆریەتەوە بەرەو دەسەڵاتی گەلو چەسپاندنی حوکمی یاسا.

( دیارە دەرکەوتنی سەدامو هاوەڵەکانی بەو چەشنە یــەکێکی تــرە لەو سەرەتا پرشنگدارانەی بەدیهاتنی ئەو خەباتە).

بۆیــە دواجــار کــورد وەکــو هێزێکــی کاریگــەری نــاو بزوتنــەوەی ئۆپۆزســیۆنی رژێمــە تۆتالیتارەکــان لەعیراقــداو بەتایبــەتی لــەماوەی

دەیان ساڵی رابردووی حوکمی بەعسدا، هەموو شێوازە ناڕەواکانی گرتە بەر، بۆ کورتکردنەوەی مەودای ئەو دەسەڵاتە کلۆرە، تاکاکام بەسەرکەوتنی ئیرادەی خەڵك، قەڵای غەدر داکەوت. کوردیش رۆڵی پێشەنگ و کاریگەری هەبوو لەو داڕوخانەدا.

مێژووی کوردایەتیش دژ بەو رژێمە، پڕە لەقوربانیدانی گەورەو خوێن و ماڵوێرانی زۆر. تا لەرێگەی خەباتی سیاسی و خەباتی شۆڕشگێڕانەیەوە توانی سەروەری مەزن تۆمار بکات.

لەمێستەشدا کەتاوانباران لەناو قەفەسی تاوانباریدا دەبینرێن و ئەو تاوانانەیان رووبەڕوو دەکرێنەوە کەهەر بەناوهێنانیان؛ نەك تەنیا مۆری شەرمەزاری بۆ خۆیان و هاوەڵەکانیان و سیستەمی بەعس دەبنە بەڵگەیەکی زیندوو، بەڵکو سەر شۆڕیی و مردنی ساردو سڕیش بۆ ئەوانە دەبەخشێنێ کەتەنیا رۆژێك لەرۆژان ناراستەوخۆش بێ خزمەتی ئەو سیستەمەو دامودزگاکانیان کردبێ. جا ئەوانە هەر کەس و گەل و لەهەر لایەنێکەوە بووبن و بن.

رووبەڕووکردنەوەی تاوانی ئەنفال و کیمیابارانکردنی هەڵەبجەو بێسەرو شوێنانی بارزانییەکان ( چوار تۆمەتەکەی تریش بەشی کوردی تێدایە)و لەناو ئەوانەشدا چەندین تاوانی تر، کەلە دانیشتنەکانی تری دادگادا رووبەڕوویان دەکرێتەوە. ئەو راستیە کەچۆن لەماوەیەکی دوورو درێژی حوکمی عیراقدا، بەتایبەتی پرۆسەی کوردڤڕان، چەندین شێوازو پرۆسەی جیاجیای بێوێنەی

بەخۆوە دیوە؛ بەچ چەشنێك كورد لەو چوار چێوەیەدا كە ناوی عیراقە تاوانی جینۆسایدی دەرهەق كراوەو كەس لەكاتی خۆیدا بەهانایەوە نەهاتووەو مرۆڤایەتیش بێدەنگ بووە لەبەرامبەریدا.

رووبەرووكردنەوەی تاوانی ئەنفال و كیمیاباران و ئەوانی تر بەرووی سەرانی رژێمی بەعسی لەناوچوودا، لەلایەك گەورەیی و مەزلومیەتی نەتەوەیەكی خاوەن كەلتورو رەسەنایەتی و مێژوو دەردەخات. لەچەندین رووی ترەوە ریسوایی و خەم ساردی دوژمنەكانی كوردو؛ هاوەڵەكانیان و دەسەڵاتدارانی سیاسەتی نێودەوڵەتی و حاكمەكانی دونیای سەردەم دەردەخات.

لەبەرامبەر بەهاكانی مرۆڤ و مافی نەتەوەكان و رووبەڕووبوونەوەی ناعەدالەتی و سیاسەتە چەوتەكانی لەكاتی خۆیدا لەسەر حیسابی گیان و مافەكانی گەلێكی وەكو كوردی بێبەشتیوان.

بۆ یەكەم جارو لەئاكامی خەبات و سەركەوتنی ئیرادەی ئازادی ویستیدا، خەڵكی كوردستان و عیراق و هەموو دونیا رووە راستەقینەو ترسنۆكەكەی جەللادیان بینی. لەماوەی سێ و پێنج ساڵ وێنەی ئەفسانەیی و ماكیاژكراوی فشۆڵەی خۆیان لەهەموو ماڵێك و هەموو رۆژ لەسەر رووی رۆژنامەكان و؛ لەسەر یەكەم پەرەی كتێبی خوێندن و لەسەر شەقامە تایبەتی و گشتییەكان و كۆڵان و تەواوی دامودەزگا حكومی ئەهلی و زوورو دوكان و بازاڕو سەرشەقامەكان و

هتد.. نمایش دەکردو، خۆی کردبوو بەگەورەو مەعصومو داهێنەرو ئازای هەموو بوارەکانی ژیان.

دواجار جەللادو بێچوەکانی لەماوەی دەسەڵاتیدا پست بەبستی ئەم وڵاتەی بەترسو تۆقاندن چاندبوو، بۆیە رۆژانە مەرگو بێدەنگی بەرهەم دەهێنا.

لەبارەی کوردایەتیشەوە یەکێك لەدروشمە سەرەکییەکانی هاتەدی، کەخەباتکردن بوو لەپێناو رووخاندنی رژێمی دیکتاتۆریکو، هەوڵدان بۆ هێنانە کایەی رژێمێکی دیموکراتی لەعیراقدا، لەمەشیاندا کورد دەتوانێ لەچوارچێوەی ئەو عیراقەدا کەدادەمەزرێتەوە شانازی گەورەی پێوە بکات. لەو روانگەشەوە دەشێ لایەنەکانی ترو گەلانی تری عیراق بەبەردەوامی رێز لەو خەباتو فیداکارییەی کورد بگرن نەك بەپێچەوانەکەیەوە.

ئەو تۆمەتانەی رووبەرووی سەدام حسێنو عەلی کیمیایکو ئەوانی تر کراوەتەوە.

کورد لەناویاندا بەشی شێری لەو خاڵانە بەرکەوتووە،واتە قوربانی بەردەوامو سەرکوتکراو کورد بووە. ئەمەش جارێکی تر دەلالەتو خوێندنەوەی خۆی هەیەو؛ خوێندنەوەی نوێتریش هەڵدەگرێ، کەواتە دەردەکەوێت کورد بەزۆرینەی چینو توێژەکانیەوە نەیارو دژبووە لەگەڵ دیکتاتۆرییەتدا.

دواجار بەو نەیارییەی گەورەترین قوربانی بەخشیوە.

لەئێستادا پێویستە لەسەر سەرجەم دەسەڵاتدارانی عەرەب و رۆشنبیرەکانیان بەشێوەیەکی رەسمی هەروەکو نەتەوە هەروەکو حکومەت داوای لێبوردن بکەن. بەرامبەر بەو ناهەقییەی کەلەلایەن حکومەتێکی عەرەبی دەسەڵاتدارەوە لەمێژووەوە تا ئەم سەردەمەی دوێنێ کەکراوە هەروەکو چۆن (خالد ئەلقشتینی) نوسەرو رۆژنامەنووسی عەرەبی عێراقی دەڵێ: ((پێویستە ئێمەی عەرەب داوای لێبوردن لەکورد بکەین لەسەر ئەو شتانەی کەلەدژیان ئەنجام دراوە,وە قەرەبووی ئەو خێزانانە بکەینەوە کەزیانیان لێکەوتووەو کەسەکانیان لەدەست داوە)).

ئەو تۆمەتانەی دراونەتە پاڵ تۆمەتباران بەجۆرێکن بەهەناسەش نکۆڵی کردنیان لێناکرێت. چونکە رژێمی بەعس بێباکانەو بەشانازییەوە لەدەزگاکانی راگەیاندن و کۆبوونەوە کراوەو داخراوەکانیان: بەراشکاوی باسیان لەهاریکو درێی خۆیان دەکرد. بەرامبەر چۆنییەتی ئەنجامدانی چالاکی کیمیابارانکردن و, زیندە بەچاڵکردن و کوشتنی خەڵکی سیڤیل و بێدیفاعەکانی گوندنشینان و لادێکانی کوردستان لەشوێنە دیارو نادیارەکاندا.

لەو پێناوەشدا سەرە هارەکانی بەعس لەپێشبڕکێدابوون بۆ ئەوەی زۆرترو زیاتر زیان لەکوردستان و بەتایبەتیش مرۆڤی کورد بشێوێنن.

وەکو چۆن عەلی کیمیایی لەساڵی هەزارو نۆسەدو هەشتاو نۆدا لەبارەی چارەنووسی ئەنفالکراوەکان بۆ بیرۆی باکوری عێراق قسە

دەكاتو دەڵێ: **(دەبوو چی لەو ژمارە زۆرەی خەڵك بكرایە؟ ئایا دەرز بوو لەشوێنی باش بیانهێڵینەوە؟ من چی لەمانە بكەم؟ لەم بزنانەیا تاكام لێیان بێت؟ ئەمڕێ بە بلدۆزەر دەیانشەمە ژێر خاكەوە).**

وەك دەركەوت بەهای مرۆڤ و، مرۆڤی كورد لای بەعس لەبەهای ئاژەڵ كەمتربووە. وەكو چۆن ئەو هەڕەشانەی كەكردویانە بەزیادەوە جێبەجێیان كردوە.

عەلی حەسەن مەجیدی ئامۆزای سەدام حسێن لەجێیەكی تردا و لەبارەی كیمیابارانكردنی گوندەكانی كوردستانو سوكایەتی كردن بەخەڵكانی گوندنشین. لەبەڵگەنامەیەكدا كەلەرزگاركردنی شاری كەركوك لەراپەڕینی ساڵی هەزارو نۆسەدو نەوەت و یەك لەماڵەكەی خۆیو لەئۆفیسەكەیدا دەست كەوتووە دەڵێت: **( هەموویان بەچەكی كیمیایی دەكوژم كێ هەیە شتێك بڵێت؟ كۆمەڵگای نێو دەوڵەتی؟ دەیانگێم كۆمەڵگای نێو دەوڵەتیو ئەوانەش كەگوێیان لێدەگرن).**

لەو بەڵگەنامەیەدا بەئاشكرا هاتووە كەچۆن عەلی كیمیایی نەك هەر سوكایەتی بەهەموو بەهایەكی ئەخلاقیو مرۆژانە دەكاتو، گومڕایانە هەڕەشەی كوشتن بەكیمیاویش دەكات. لەپاڵ ئەوەشدا بەوشە نەشیاوو بێ حورمەتیەكانی خۆیو سەدام ئاسای ئامۆزای، ئەوانەش (دەگێت) كەلەسەر كورد بێنە دەنگ و؛ بێباكانە سوكایەتیش بەكۆمەڵگای نێودەولەتیش ئەكات!!

ئالـەم گۆشـە نیگـای بیرکردنەوانـەی جـەللادەوە. تاوان و گومرایی ئـەو رژێمـە هـارەی بـەعس لەهـەزار بەڵگەنامـەو دیکۆمێنـت و گۆتـەو رەفتـاردا دەگمنـە ئـەوجی بـاڵاکردن و دەردەکـەوێت ئیـدی هـیچ کـارو میکانیزمێکی دزێوو قێزەون نامێنێتەوە دەرهەق بەکوردو خاکەکەی نەیگرنە بەر لەماوەی حوکمی رەشیاندا.

تارق عەزیزیش کەیەکێکە لەو چەند کەسەی رووبەرووی دادگا دەبێتەوە، لەگفتوگۆی ساڵی ١٩٨٤ی نێوان رژێم و یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا، لەدانیشتنێکدا بەراشکاوی بەسەرکردەکانی شۆرشی کوردی راگەیاندبوو، ئەگەر ئێستا رێک نەکەون لەگەڵمان بەو جەشنەی کەدەمانەوێت و یارمەتیمان بدەن، ئەوا هەرکە شەری نێوان ئێمەو ئێران کۆتایی پێهات، خۆتان هەموو گوندەکانتان لەناو دەبەین.

گوندەکان و بەشێکی زۆری خەڵکەکەیان لەناودا، بەڵام ئەویتریان پێیان نەکرا!.

رێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتیش لەراپۆرتێکیدا بەروونی باس لەپێشێلکردنی مافی مرۆڤ دەکات لەلایەن رژێمی بەعسەوە لەعیراقدا بەتایبەتی دوای راپەرینی ئازاری ساڵی ١٩٩١ لەناوچە جیاجیاکانی عیراقدا. لەمەیاندا زۆرترین تاوان بەرامبەر دانیشتوانی شارنشین ئەنجام درا، بەتایبەتیش ئەو شارانەی بەشداری راپەرینیان کرد.

راپۆرتەکە ئاماژە بەوەش دەدات کەلە ئەنجامی ئەو تاوانە درندانەیەی بەعسدا زیاتر لە دوو ملیۆن خەڵک ئاوارەی سنورەکانی

ناوخـاکی وڵاتـانی وەکـو ئێـران و تورکیـاو. هـەروەها بەشـێکیش لەجنوبەوە ئاوارەی کوێت و سعودیەش بوون.

لەجێیەکی تریشدا تیشك دەخاتە سەر ئەوەش. کە زۆربەی ئەو خەڵکانەی لەکوردەکان بوون. دیارە مەبەست لەو ئاوارەبوونە کۆڕەوی چەند ملیۆنی کوردە. کەبەهەزاران خەڵك لەڕێگادا لەبرساناو لەبەر سەرماو سۆڵەی سەختی سنورە شاخاوییەکان گیانیان لەدەستداو. ئەوانی تریش بێ ماڵ و حاڵ مانەوە.

جەللادەکانی دوێنێ. ئەمڕۆ لەڕووبەڕووکردنەوەی ئەو تاوانانەدا کەمزۆرینەیان و تاوانە سەرەکی و گەورەکانیان دەرهەق بەخەڵکی کوردستان بوو. لەبەشی سەرەوەی ریزبەندی تۆمەتەکاندا هاتبوون. هەم خودی سەدام و هەم هاوەڵەکانی ناراستەوخۆش. نەك نکۆڵییان لێنەکردن. تەواو رەزیل و (دەم تەڵەی تەقیوو بوون) بێوێنەیەکو گەورەیی تاوانەکان بەجۆرێکن دەرفەتی هیچ خۆ لێبواردنێك یان پاساو هێنانەوەیەك نامێنێتەوە. جگە لەبێدەنگی و لاساری کردن و دواجاریش دانپیانان.

وەکو چۆن لەیەکەم رووبەڕوو بوونەوەدا بێدەنگییەکی کوشندە سیمای شڵەژاوی جەللادەکانی داپۆشی بوو.

بەو هیوایەی ئەم دەرفەتە زەمینەی فراوانتر لەناوچەکەدا خۆش بکات بۆ راپێچکردنی هەموو ئەو جەللادە گەورەو وردانەی

مێژوویەکی درێژە مافەکانی کورد بەبەرچاوەوە پێشێل دەکەن و دەیچەوسێننەوە.

ئەوەی ماوەتەوە بوترێ، ئاراستەکردنی گەورە کارتی قوربانیکو زامەکانی کورد بەڕووی ئەنجامدەرانیدا. دەشێ لەنێو تۆمارە پاساییەکاندا بچەسپێنرێ و ببنە بەلگەیەکی هەرە زیندوو بۆ دەرخستنی حەقیقەتی زیانی مەزلومترین گەل و نەتەوەی ئەم سەر زەمینە کە (کورد)ە..

هەروەها ئەم دیمەنی دادگایی کردنەی جەللاد ببێتە سەرەتایەك بۆ ڕێگە گرتن لەو سوکایەتیو ماف خواردنەی لەمرۆڤی کورد دەکرێ لەولاتانی تریشدا.



## سەرچاوەکان

- بازنـەکانی ململانێو ئاسایـشی نەتـەوەی کـورد_ مـەحمودی مـەلا عـززەت_ چـاپی دووەم_ سلێمانی_ سـاڵی ١٩٩٩.
- عـیراق و تـاوانی جینۆسـاید (شـاڵاوی ئـەنفال دژی کـورد)وەرگێڕانـی لەئینگلیزییـەوە جـەمال مـیرزا عـەزیز_ بەرلین _ساڵی ٢٠٠٠.
- منظمة العفو الدولية _ نقض العهود واهدار حقوق الانسان فی کردستان العراق منذ عام ١٩٩١.
- ئاسۆ ژمارە _٨_ ساڵی یەکەم _ ٢٠٠٤.



## پرسی ئەنفال

## لەبازنەی گوتاری سیاسی کورددا

لەماوەی ئەم چەند ساڵەی دواییدا زۆرێك لەقەڵەمی كورد وەكو جۆرێك لەراهاتن و، بەیەك تەوژمی باو لەنوسین و دەربڕین راهاتوون بەشێوەو جۆری ئینشایی و نەسیحەت ئامێز رەخنە لەوهەڵسوكەوت و دەركەوتەو دیاردانە بگرن. كەلەهەمناوی كۆمەڵگا بەگشتی و ناو كایەكانی دەسەڵاتی كوردییەوە بەتایبەتی سەرچاویان گرتوە.

ئەگەر رۆژنامە رۆژنامە كوردییەكان بەگشتی بخەیتە بەر سەرنج ئەو سەبكە بەئاسانی بەدی دەكەیت كەلە بەردەم دیاردەیەكی دزێودا یان ساتەوەختێكدا كەدەبوو دەسەڵات قسەی تێدا هەبوایەو، نەیبوە نوسەرەكە دێت و تارو نوسینەكەی بەكۆمەڵێ دەستەواژەی ( دەبێ وابكرێ.. دەبوایەوابوایە.. باشترە بەو جۆرەبێ.. نابێ ئاوابێ.. هتد). دەتەنێ لەچەندین هاوكێشەی تەمومژاویی و دواجار دەربڕینێكی سازشكارانەی مەبەست ونكردوو، ئەوەی پەیوەندی بەدەسەڵاتی سیاسی كورد لەكوردستانەوە هەیە، لەراستیدا كەمترین و بچوكترین ئاوڕدانەوەو جوڵاندنی بۆ ئەو جۆرە نەسیحەتكردنەو، رێنپیشاندانە نكیەو؛ كەمترین كاریگەری ئەو سەبكە نوسین و گازندەییانەی لەسەر بووەو كاریتێكردوە.

دیاره ئەگەر وابوایە (دەبوایە لەکوردستاندا کورد هیشەکێکی بەمێشولەیەکی ناو وڵاتەکەی خۆیەوە نەنایە. بەڵام کورد بەدەستی خۆی ماڵی خۆی وێران کرد).

راستیەك هەیە کەچیدی نێمە لەبەردەم مەسەلەیەك یان چەند پرسـێکی چارەنوسـسازی نەتەوەکەمانـدا هـەرگیز نـاتوانین لەپەراوێزخستنیدا بێ دەنگ بین.

ئەگەر لەسەر چەند مەسەلەکی راگوزەریدا بێدەنگی نوێنرا ئەوە شتێکی تـرەو، دەشـێ پاساوو قسەی تـر هـەڵبگرێ. بـەڵام لەبەرامبـەر پرسێکی وەکو پرسی ئەنفالدا کەلـەناو سـەرلەبەری کایـەی دەسـەڵاتی کوردییدا، پرۆژەیەك نەك بەقەد گەورەیی پرسەکە، بەڵکو لەئاستێکی زۆر زۆر نزمیشدا درك پـێ ناکرێـت. ئالەمـەداو لـەم دۆخـەدا نوسـەری کـورد لەبەرامبـەر ئـەو زەنگـە ترسـناك‌و مەترسـیدارەدا دەبـێ بـچێت کایەی سیاسی کوردی بخاتە بەردەم پرسیارێکی گەورەو خوێندنـەوەی بۆی هەبێ، کە ئاخۆ هۆکارە بنەڕەتیەکان لەکامەو لە چ مەنهەجییـەت‌و بیرکردنەوەیەکەوە سەرچاوە دەگرن؟.

بـەدیوێکی تـردا "دەبێـت لەخـەیاڵ‌و عەقڵیەت‌و وێناکردنـەکانی سیاسـەت لەکۆمـەڵگای خۆمانـدا بـڕوانین.. دەبێـت بـچین بونیـادی دەسـەڵات لـەناو حزبـی سیاسـی کوردیـدا، پەیوەنـدی نێـوان کاریزمـاو دەســەڵات، پەیوەنــدی خێــڵ‌و خێــزان‌و بنەماڵــە بەدەســەڵاتەوە،

بخوێنینەوەو رەگە قوڵەکانی ئەم تێکەیشتنە تایبەتە بۆ سیاسەت بدۆزینەوە".

لەکاتێکدا لەبەرامبەر مەسەلەیەکی پڕ ئێش و مەترسیداری ناو واقیعی کوردەوایی لەئەجێندای سیاسی دەسەڵات و حزبەکانیشدا بەدی ناکرێت.

ئەو کاتە دەبێت وەزیفەی حیزب بەچ ئاقارێکدا بخوێنینەوە کەلەمەڕ مەسەلە گشتی و تراژیدیا گەورەکان بەکارەکی ئیشی لەسەر ناکات.

گەر روونتر قسە بکەین؛ بۆ نمونە تەماشاکە لەسەروەختێکدا کەلەحوکمی تازەی عیراقدا بەنۆرە دەسەڵات دەدرێتە دەست هەرکەسێك لەئەندامانی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی حوکم لەعیراقداو، کاتێك نۆرە دەگاتە سەر دەسەڵاتی یەکێك لەسەرکردە کوردیەکان، کەسەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانە. لەهەمان کاتدا یادەوەریی و ساڵرۆژی کارەساتێکی گەورەی وەك ئەنفال؛ دەکەوێتە ناو ناوەڕاستی رۆژانی حوکم و دەسەڵاتی ئەوەوە (ئەنفال) ێك کەلەسەدا هەشتاو پێنجی گۆڕە بەکۆمەڵەکانی عیراق لەوانن. واتە لەرۆژی ١٤/٤دا کاتێك دەسەڵات بەدەست سەرکردەیەکی کوردەوەیەو هیچ دەربڕین یان بەیاننامەو گوتارێکی نییە بۆ ئەو رۆژو کارەساتە. پرسیارێکە دەبێ بمانهەژێنێ بۆ رامان؟. هەر هیچ نەبێ دەکرا ناوەندەکانی راگەیاندن و

ئاژانس و میدیاکانی جیهانی کۆبکردایەتەوەو لەناو هۆڵی ئەنجومەندا ئەو تراژیدیایەی بەبیری هەموو لایەکدا بهێنایەتەوە.

دەبوو ببوایەتە نەریتێك دەسەڵات و حوکم لەعێراقدا ساڵانە لە یادەدا قسەو پەیامی هەبوایە..

دەبوو ئەو رۆژو کارەساتە بقۆزرایەتەوە؛ تاوەکو بەساردی لەرۆژێکی ئاوادا چ ئاماژەیەکی رەسمی داوای دیاریکردنی چارەنوسی ئەو هەموو خەڵکە بێسەرو شوێنە بکرایە.

دەبوو " داوای دادگایی کردنی هەموو ئەوانە بکرایە کەلە نەخشەدانان و جێبەجێکردنی ئەنفالدا بەشداریان کردوە".

ئەوەی پێویستە بکرێ و ناکرێ لەساتەوەختێکی ئاوا گرنگدا, کە دەدرێتە دەست سەرۆکی حیزبی سیاسی خوێندنەوەی قوڵ و تێرامانی وردی دەوێ. ئالەوەو چەندین تێبینی ترەوەیە کەدەوترێ لەدەسەلاتی سیاسی کوردی لەمەڕ پرسێکی هەرە پڕ هەستیاری ناو مێژووی ئێستای کوردا بێ بەرنامەیی پێوە دیارە.

خۆ ئەندامە کوردکانی تری ناو ئەنجومەنی حوکم لەوێ بوون، ئایا نەدەکرا وەك بیرخەرەوەکیش بوایە، بەبیری سەرۆکی دەسەڵاتی بهێنایەوە, کەئەمڕۆ یادەوەری ئەنفالە دەکرێ لەرووی سیاسیەوە کورد ئیشی خۆی لەسەر بکات؟

باوا دابنێین پرۆسەی ئەنفالی دژ بەکوردان؛ بیری لێ فیکرو عەقلی بەعسدا خەملی و دوێنێ جێبەجێ کراو ئەمڕۆش بەسکوێترین برینی خستۆتە جەستەی کۆمەڵگەی کوردەوارییەوە.

یاخود لەبەرامبەر بێدەنگبوون و ساردی لەرۆژێکی ئاوادا چ ئامانژێکی مەترسیدارتربێ. کەدەبوو بەبەردەوامی کایەی سیاسی کوردیی و دەسەڵاتەکەی ئەوە زەمەنە تاڵەو پرۆسەکانی کوردقڕانیان نەک؛ هەر لەیادەوەری سیاسیدا بێ. بەڵکو لەسەرەکیترین پنت و ئەرکەکانی بیرکردنەوەو رەفتاریاندا لەئاستی بەرپرسیارەتی مێژوویی و ئەخلاقی نەتەوەکەی خۆیاندا بن. بەبیریاندا بێتەوە کەمێژوومان بەسەر چەندین تەڵەی مەرگ چێن و تەڵەزمی گەورەدا بازی داوەو تێکەوتوە تێپەربوە تاوەکو کار گەیشتۆتە ئەمڕۆ...

بۆیە پرسی ئەنفال کەپرۆسەیەکی تەواو بەرنامە پێشتر بۆ دارێژراوی سیاسی و سەربازی و لۆجستیکی هەمەلایەنەی تەواو دژ بەمرۆڤانە ئەنجامدراو کوردستانی ئاوەدانی گۆڕی بەوڵاتێکی وێران توخمەکان ژیانی تێدا هەموو فڕکرد.

بەڵام لەراستیدا روونە کە "هیچ جەنگێکش نییە پەیوەندی بەسیاسەتەو نەبووبێت و ئامانجی سیاسی لەپشتەوە نەبووبێت.

ئەوەی کەرژێمی بەعس لەئەنفال دا ئەنجامی داوە؛ ئەڵقەییەکی نەپچڕاوەیە لەزنجیرەی ئەو جەنگەی کەدژ بەگەلێکی مەدەنی

لەسەرخاکی خۆی بۆ تێکدانی روخساری نەتەوەیی و ستراکتۆرەی کۆمەلایەتی و کەلتووریی".

ئەوەی مایەوە دواجار بەگۆڕانی زەمەن و، کەوتنەوەی گۆڕەپانی ململانێ و رووداوەکان بەجۆرێکی تر، وا کەوتەوە کەکورد ببێتە خاوەنی دەسەلات و خاوەن ناوچەیەکی فراوانی خۆی لەکوردستاندا..

ئەم زەمینەو دەرفەتەش رێخۆشکەربوون کەسالانە وەکو بۆنە نیشتمانی و نەتەوەییەکان ئەنفالیش وەکو تراژیدیایەکی گەورە لەرۆژی دەستپێکردنی شالاوی یەکەمی ئەنفالدا یادیان بکرێتەوە.

سەرنجێکی تر لێرەدا ئەوەیە کەبەشێکی دەسەلاتی کورد بەهۆی جۆری پەیوەندی و خوێندنەوەی سیاسیانەی بەرژەوەندیەکانی خۆی لەگەل دەسەلاتی دەوروبەردا، زۆرێك لەو سالانە راگوزەریانە ئەو یادەی بەرێکرد، یاخود بەجۆرێك ناو دەهێنرایەوە کەبەوردی دانی بەگەورەیی تراژیدیاکەو گەورەیی تاوانەکەو، ئەنجامدەرانی و ئەوانەی لەپشتی کارەساتەکەوە چاو ساغبوون نەدەنا.

وەك لەمێژووی میللەتانی خاوەن تراژیدیادا، کارەساتەکان روون دەبێتەوە. دەبینرێ ئەوانەی کەخاوەن دەسەلات و جێوەیەکی سیاسی نەبوون، کتومت لەساتەوەختی خۆی و نزیکتردا نەیانتوانیوە وەکو پێویست کار لەسەر گێڕانەوەی ماف و چارەنووسی کۆستەکان بکەن. لەگرتنەوە دەستی دەسەلاتیشدا یاخود هاتنە پێشەوەی بەرژەوەندی و دەرفەتەکاندا ئەوە خەملیوە.

لەم سۆنگەیەوە بۆ کورد ئێستا لەهەموو کاتێک لەبارترە بۆ ئیشکردن لەسەر ئەو پرسانە. لەکاتێکدا خودی دەسەڵاتی سیاسی کوردی بەشداری راستەوخۆ دەکات لەبەڕێوەبردنی دەسەڵات لەعێراقداو ئەو رژێمەی کەمۆرکی کارەساتەکانی بەنێو چاوانەوەیە سەرنگوم کراوەو، رەمزی ئەنجامدەرانیشی لەزیندانداان.

وەك چۆن دەوترێ"هیچ نەتەوەیەك نەیتوانیوە پرۆسەی لەناوبردنی خۆی بکات بەقەزیەیەك کەهەموو دونیا قسەی لەسەر بکات، مەگەر پاش ئەوە توانیبێتی دەسەڵاتی سیاسی بۆ خۆی پێکبهێنێت. نەتەوەکان هەمیشە دوای کۆتایی هاتنی تراژیدیاکان توانیان ئیستسماری بکەن".

کەوابوو زەمینە سیاسیەکە بەجۆرێك رەخساوە کەهیچ کەمتەرخەمییەك لەبارەی ئەو پرۆسە گەورانەوە مایەی پرسیاری گەورەو هەژانی گەورەنەو، دواجار بێ دوو دڵیو مەترسی، ئەبێ بوترێ هوشیاری خەڵك لەحاڵی حازردا لەئاستێکدایە، کەبەرپەرچی ئەو کەلێنە بەرینەو ئەو نوقسانییە دەداتەوە، کەکایەی سیاسی دەسەڵاتی کوردی بەخۆوە دەیبینێ. بەرۆشکو خەمی خەڵکو پرۆژە تاکەکەسیو تایبەتیەکان لەمەڕ پرسی ئەنفال لەئاستێکدایە بەپلەی سەدوهەشتا دەرەجە لەگەڵ خەمو پرۆژەی دەسەڵاتدا جیاوازەو لەپێشە.

خۆ ئەگەر پرسی ئەنفال لەناو بازنەی کاری سیاسیی کوردیدا خوێندنەوەی تری بۆنەکرێو پێداچوونەوە بەخۆدا لەلایەن دەسەڵاتی سیاسیەوە لەمەڕ ئەمە نەبێتە خەمی چاکسازیانەیان، ئەوا لەلایەن خەڵك و شەقامی کوردیەوە تادێ ئەو درزە زیاتر بەرفرە دەبن و ئەنجام کێش و سەنگی هەڵوێستەکان و دەسەڵاتە سیاسیەکانی کوردستان دەخرێنە بەر خوێندنەوەی روونتر.



## سەرچاوەکان


- کتاب کوردستان _ مەریوان وریا قانع_ ژمارە دوو ساڵی۲۰۰۲ لاپەڕە۲۰۵
- هەمان سەرچاوەی پێشوو_ لاپەڕە ۲۰٤
- ئەنفال _کوردو دەوڵەتی عێراق _شۆڕشی حاجی ڕەسوڵ _چاپی دووەم _ ساڵی ۲۰۰۲
- لەپەراوێزی ئەنفالدا _تەها سلێمان _بەرگی یەکەم ساڵی۱۹۹۹
- هەڵەبجەو ئەنفال _ سالار حەمەسور باسیرە _ لاپەڕە ٦٥ سلیمانی _ ساڵی ۲۰۰۲
- کوردڤران _لەتیف فاتح _ مەجید ساڵح _لاپەڕە _ ۲۲۱ بەرگی یەکەم _سلێمانی _ ساڵی ۲۰۰۲



## ئەنفال

# دەستپێکی حەڵاڵکردنی سەرو ماڵی کورد

بەر لەپەلاماردانی هەمەلایەنەی شاڵاوی رۆژی ۲۳\۲\۱۹۸۸ی رژێمی بەعس، بۆ سەر ناوچە رزگارکراوەکانی کوردستانو بارەگاکانی سەرکردایەتی(ی.ن.ك)و هێزی پێشمەرگە. کەبە(ئەنفالی یەك) ناوزەدکراوە.

رژێمی بەعس دوای هاتنەوە سەرحوکم لەعێراقدا، واتە لەساڵی ۱۹٦۸ەوە پلانی تایبەتی یەکلاکردنەوەی کێشەکانی هەبوو لەگەڵ کوردو خەڵکی کوردستاندا، بەرنامەکانیشی وەك دەرکەوت هەموو لەچوارچێوەی زەبرو زەنگو کوشتنو کاولکردندا دارێژرابوو. لەو پێناوەشدا توانایەکی دارایىو ماڵی زۆری وڵاتی بۆ ئەو مەبەستانەو جێبەجێ کردنی مەرامەکانی تەرخان کردبوو. بەگەڕانەوەمان بۆ خوێندنەوەی رووداوەکانو شێوازەکانی مامەڵەکردنی رژێمەکە لەگەڵ دۆزی کوردو شۆڕشو خەڵکەکەیدا هەموو ئەو رێو شوێنە سیاسىو سەربازی ئابوریانەمان بەسانایی بۆ روون دەبێتەوە کەچۆن بەپێی پلانێکی سیستماتیزەکراو گیراونەتە بەر بۆ نزیکبوونەوەیان لەمەبەست. تەواوکاریی بەرنامە درێژ خایەنەکانیان. کەبەشێك لەو کردەوە سەربازیانەی ئەنجامدراون هێشتا لەمێژووی دوورو نزیکی

مرۆڤایەتی‌و تۆماری کردەوەی دیکتاتۆرەکانی جیهاندا شتێک کەم وێنەن (کەمەندێك ناوا گوزارشتی لێدەکەن) بەڵکو بێوێنەن. لەبەر ئەوەی لەسایەی پیلانێکی شاراوەو داخراودا تاوانەکان جێبەجێ کراون. هێشتا بەشێك یان چەند دیوێك لەهەر یەك لەو تاوانانە بەشاراوەیی ماونەتەوە.وەك پێویست نەتوانراوە هەڵوەستی پڕ بەقورسایی تاوانەکان‌و کاریگەرییەکانی خوێندنەوەمان بۆی هەبێ‌و شەنوکەو بکرێ. ئەم رەخنەیە ئەستۆی نوسەرانی کورد دەگرێتەوە. بەتایبەتی ئەو قەڵەمانەی زۆرتر خۆیان بۆ بوارە تراژیدیەکان تەرخان کردووە.

لەساڵی ١٩٦٨ەوە بۆ ساڵی ١٩٨٨ لەماوەی ئەو بیست ساڵەداو تارۆژی راپەگەیاندنی دەستپێکردنی شاڵاوەکانی ئەنفال سەدان‌و بگرە هەزاران تاوانی کۆمەڵکوژیو گوند رووخاندن‌و باخ سوتاندن‌و راگواستن‌و لەسێدارەدان‌و.... هتد. بەشێوازو جۆری جیاجیا لێرەو لەوێی کوردستان کراون. بەڵام هیچ کام لەو تاوانانە بەقەد تاوانەکانی ئەنفال بە ئامادەکاریی تەواوەوە. بنیاکانە ناوو پێناسەی ئاشکراو دوژمنکارانەی بۆ دانەنرا بوو بەجۆرێك کەحەڵاڵی سەرو ماڵ‌و خاك‌و سامان بکات.

بێجگە لەبەکارهێنانی تەواوی توانا سەر بازییەکانی. ناونان‌و شەرعییەت پێدان بەتاوانەکانی نێو قۆناغەکانی شاڵاوەکەو دۆزینەوەی چێوەیەکی ئاینیو. پێدانی پێناسەو ناوێکی ئایینەی

دێرینی وەکو (ئەنفال) کەناوی سورەتی هەشتەمە لەقورئاندا و لەبنەڕەتدا دابەزین و زەمینەی پەیدابوونی دەگەڕێتەوە بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەی جەنگ و دەست کەوتەکانی و شێوازەکانی حەلالکردنی سەرو سامان و سەروەتی خەڵک, لایەنی تر بۆ ئەوانی تری دەست رۆیشتوو.

بەدیوێکی تردا شالاوەکە بەناوێکی کۆن و دێرینەو بەناوەرۆک و کەرەستەو تەکنیکی نوێو هاوچەرخەوە دەستی پێکرد.

لەمەوە بەخوێندنەوەمان بۆ ناوی شالاوەکە, دەبینین رژێمی بەعس چەندە بەوردی بۆ سڕینەوەو کۆتایی هێنان بەبوونی نەتەوەیەکی ترو, سڕینەوەی شوناس و تایبەتمەندییەکانی لەڕووی مادی و مەعنەوییەوە لەبۆتەی نەتەوەیەکی تردا, کەمەبەست نەتەوەی عەرەب بووە. لەچوارچێوەی کردەوەیەکی سەربازی درێژخایەنی دوور مەودای تا گەیشتن بەتروێکی مەبەستدا، چۆن ویستویەتی رەهەندە فیکری و ئایینییەکانیش لەخزمەت مەرامەکانیدا بەکاربهێنێ. تالەرێگەی ئەوانەشەوە نەك هەر دونیا بێدەنگ بکات, بەڵکو سۆزو پشتیوانیش لەو رووەوە بۆ خۆی زیاتر بکات؛ لەهەمانکاتیشدا چیتر کردەوەکانی بێ پەردەو بەراگەیەندراوی بۆگەیشتن بەو مەبەستەی ئاماژەی پێکرا پیشانبدات. ئەمەش بۆ خۆی ئەوجی دیکتاتۆریانەی سستەمی حوکم و فاشستانەترین رژێمی چەرخی نوێی دەگەیاند.

وەك دەبینین لەبەرە بەیانی دەستپێكردنی یەكەم رۆژی شاڵاوی سەربازی ئەنفالدا؛ تێكڕای دەزگاكانی راگەیاندنی بەعس كەوتنە بانگەشە بۆ سەرەتایەكی نوێ لەهاتنەكایەی تەصفییەكردن و نەهێشتنی یەكجاری نەیاریی بۆ رژێمەكە بەجۆرێك كەتەواوی رۆژنامەو گۆڤارو تەلەفزیۆن و رادیۆو ئاژانسەكانی دەنگوباسی تەرخان كرد بۆ پێدانی شەرعییەتی یاسایكو ئایینی بەو دەستپێكە لەكۆمەڵكوژیكو رووخاندن و سوتاندنەی لەژێر ناوی قۆناغی یەكەمی شاڵاوی ئەنفالدا لەكوردستان. سنوری پەلامارە سەربازییەكانی رژێم لەم قۆناغەدا پێكهاتبوو لە ناوچەكانی سەربە دوكان، بنگرد، سلێمانی، ماوەت، ئەزمەڕ، سوسێ، چوارتا، سورداش و بارەگاكانی سەركردایەتی یەكێتی نیشتمانی كوردستان و بەتایبەتی رادیۆی دەنگی گەلی كوردستان (كەبێ دەنگ كردنی كاریگەری خێرای دەبوو لەسەر ورەو باوەڕی خەڵك و هێزی پێشمەرگە لەناوچەكانی تر) لێ بوو دەست پێكرد.

لەسەر بەكارهێنانی هەموو توانا سەربازییەكانكو سەرەتاش بەتۆپباران و كاتیۆشا بارانكردنی ناوچەكان بەخەستیكو، كیمیابارانكردنیان لەرێگەی فرۆكەو بۆمبەوەو بەشداریی پێكردنی دەیان هەزار جاش و هێزی ئاسمانكو زەمینی، رژێم توانی لەماوەی بیست و چوار رۆژداو دوای بەرگرییەكی زۆری هێزی پێشمەرگە،

رۆژی ۱۹۸۸/۲/۱۹ سەرکردایەتی هێزە چەکدارەکانی رژێمی بەعس بەلاغی ژمارە (۳۰۸۷) ی لەبارەی راگەیاندنی سەرکەوتنەکانی لەو شەڕانەدا دەرکردو لەلاپەڕەی یەکەمی رۆژنامەکانو، سەردێڕی هەواڵی رادیۆو تەلەفزیۆنەکانی عیراقەوە بڵاوکرایەوە.

لەدەرکردنی ئەو بەیانەوە، کەبەناوی (ئەنفال)ەوە بڵاوکرایەوەو لەو رۆژەوە ئەو وشە شومە کەوتە ناو فەرهەنگی سیاسیو مێژووی کوردەوە.

خودی سەدام حسێن بە ئاشکراو لەنزیکەوە چاودێریو سەرپەرشتی ئەنفالی یەکی دەکردو سەرکەوتنی ئەو قۆناغەی بەسەرکەوتنی مێژووی دەزانی بەسەر بزوتنەوەی کوردایەتیدا، بۆیە لە۱۹۸۸/۳/۱۲دا خۆی هاتبوە شاری سلێمانی بۆ ئەوەی زۆر لەنزیکەوە چاودێری هەنگاوەکانی پەلامارە درندانەکانی لەشکرەکەی بکات.

راستییەك هەیە دەبێ هەمووان بیزانین، کەلە دەستپێکردنی یەکەم قۆناغی ئەنفالەوە هیچ رێوشوێنێکی شاراوە نەما لەکوشتنو سوتاندنو ژیان فڕکردن لەکوردستاندا، لەلای بەعسو دامودەزگاکانی، بەڵکو زۆر بە ئاشکراو، زۆر جاریش لەرێگەی میدیاکانییەوە بۆ تا ئەوجی چاو شکاندنو؛ تێکشکاندنی کەسایەتیو بوونی کورد، درندایەتیو تاوانەکانی خۆی بەشانازیو هێمای سەرکەوتنەوە پیشان دەدا.



## لەکوردستان جاشێ و.

## لەهۆڵەنداش فرانس ڤان ئانرات

مایـەی تێڕامـانی وردە کـەداوی ئـەوەی ڕێکخـراوی چـاک، بەدواداچـوونی تـەواوی هـەبوو لەسـەر ئـەو هاوڵاتیـە هۆڵەندیـەی کەیارمـەتی ڕژێمـی سـەدام حـسێنی دا بـوو، لـەدابینکردنی گـازی ژەهراویو بەتایبەتی لەو جۆرەی کەلەساڵی هەشتاو هەشتدا بەسەر شاری هەڵەبجەی کوردستاندا ڕژێنراو بووە مایەی کوژرانی هەزاران هاوڵاتی.

هـەر چـەندە درەنـگ وەخـت بـوو بـەپێزانینی ڕاستی دەست تێوەگلانی هاوڵاتیەکی هۆڵەندی بەناوی (فرانس ڤان ئانرات) لەلایەن دامودەزگاکانی دەوڵەتی هۆڵەندیو بەتایبەتیش دادگای هۆڵەنـدی لـەو تاوانـە، بـەڵام بـۆ (تـأديبي ظمـير) ی خۆیـان هەسـتان بەلێکۆڵینـەوە لـەجۆری تێوەگلانەکـەو دواجـار ئـەو فایلـە خرایـە بـەردەم دادگـای وڵاتەکـەو ئـەوەش زانـرا کەرۆژنامـەو میـدیاکانی هۆڵەنـدا ڕەخنـەی توندیان ئاراستەی ئـەو تاکـە کەسـەی کۆمەڵگاکـەی خۆیـان کـردو، بەیـەکێک لەتاوانبارە سـەر سـەختەکانیان لەقەڵەمـدا. وەك دەبیـنین کۆمـەڵگای هۆڵەنـدیو حکومـەتی هۆڵەنـدا جگـە لـەوەی لـەرووی ویژدانیو مرۆڤایەتیەوە، دوای ناسینی کیمیابارانی هەڵەبجەو ئـەنفال

وەك خۆی نەیانتوانی لەو کردارەی هاوڵاتی خۆیان بێ جەنگی هەڵبژێرن، بەڵکو لەرێگەی دادگاوە ئەو تاوانبارە سزای یاسایی خۆی وەرگرت.

ئەمە ئەو مانایە دەگەیەنێ وەکو دەرستێکی مێژووی بێ بۆ هەر تاك و گروپێ یان کۆمپانیایەك، بیەوێ بازرگانی لەو جۆرە بکات، رەوشە ویژدانی و مرۆڤایەتیەکان لەبەرچاو نەگرێت و ئەخلاقیاتی کۆمەڵگایەك کەئیدعای پاراستنی مافی مرۆڤ و بەرهەمی دوور لەتوندو تیژی و کوشتار ئەزرێنێت. ئەوە هۆڵەندا کەگەلەکەی ئەو ئەبوو ئەنفال و کیمیاباران بکرێ.

پرسیار لێرەدا دروست دەبێ: ئایا ئەو گەلەی کەئەنفالکراو کیمیاباران کرا، پۆلێن و خوێندنەوەی هەبووە بۆ ئەو کارەسات و کۆستە گەورانەی بەسەریدا هات؟.

ئایا تەواوی کارەکتەرە حەقیقیەکانی ئەنجامدەری ئەو تاوانانەی دەست نیشان کردوەو ناساندوە؟.

ئایا لەو هەزاران کەسەی کەراستەوخۆو ناراستەوخۆ بەشداریان کرد لەناوبردنی سەدان هەزار لەهاوڵاتی بێ گوناه هیچیان بەو تۆمەتە درانە دادگا بۆ لێکۆڵینەوە؟.

ئایا هیچ یەکێك لەو جاش و سەرگەورانە، ناچار کران داوای لێبوردن لەگەڵ و نەتەوەو کەسوکاری شەهیدو ئەنفالکراوەکان بکەن؟ز

بێ شک هیچ یەکێک لەوەڵامەکانی ئەو پرسیارانەو چەندین پرسیاری تری لەو بابەتەش نەرێنەو بۆ خۆی چەندین کەلالەی پێناسە ئاسای بێ ئینتمایکو بێ باکو نەخوێندنەوەی مێژوومان بۆ دەردەخات. ئەتەوەیەک خاوەن کۆستی ئەوەندە گەورەو، هەڕەشەو مەترسی لەناوبردنی گەورەو، لەبەرامبەریشدا بچکوکترین هەڵوەستەی جدی نەبێ، بۆ ناسینو دەست نیشان کردنی کرمە خۆییەکانو ئەوانەی لەهەر گۆڕانێکی تری دۆخەکەدا بەئاراستەی نالەبار بونەوەی رەوتی ژیان. هیچ گومانی تێدا نیکیە بۆیان بلوێ لەجاران خراپترو لەئەوسا سورتر بەرلەشکری دوژمن دەکەون.

ئەمەیە جیاوازی نێوان کەلتورو کۆمەڵگاکان، لەو نمونەیەی هۆڵەندای خاوەن یەک فرانس ڤان ئانراتو کوردستانی خاوەن هەزارەها هەزار؟...

